

زنجیرەی
شاکارنووسانی
کورد ٢

# حە موڕە
# ئەمین محە مەد


کۆکردنەوە و ئامادەکردنی:
د. ئازاد حەمە شەریف

زنجیرەی شاکارنووسانی کورد لە سەدەی بیستەم دا/ژمارە (٢)

# (محەڕەم محەمەد ئەمین)ی شاکارنووس

## کۆمەڵێك وتار و لێکۆڵینەوەی ڕەخنەیی

ئامادەکردنی

د . ئازاد حەمە شەریف

مامۆستا لە زانکۆی سەلاحەدین

هەولێر - ٢٠١١

دەزگای توێژینەوە و بڵاوکردنەوەی موکریانی

● (محەرەم محەمەد ئەمین)ی شاکارنووس

● ئامادەکردنی: د. ئازاد حەمە شەریف

● نەخشەسازی ناوەوە: تەها حوسێن

● بەرگ: ئاسۆی مامزادە

● ژمارەی سپاردن: (٦٥٤ ) لە ساڵی ٢٠١١

● نرخ: ( ٣٠٠٠) دینار

● چاپی یەکەم : ٢٠١١

● تیراژ: ١٠٠٠ دانە

● چاپخانە: چاپخانەی ڕۆژهەڵات

زنجیرەی کتێب (٥٠٦)

ماڵپەڕ: www.mukiryani.com

ئیمەیل: info@mukiryani.com

# ناوەرۆك

# برای بەڕێز کاک د. ئازاد حمد شریف

سلاو

سوپاست دەکەم بۆ ئەو ئەرکەی گرتوتە ئەستۆ سەبارەت بەو کتێبەی لەسەر باوکم ئامادەی دەکەیت.

ئێمە وەك بنەماڵەی ئەو شەهیدە بەوپەڕی توانامانەوە هاوکارت دەبین وە خۆشحاڵین کە بەرهەمەکەت شایستەی ئەو نووسەرە بێت بۆ خزمەتی وشەی کوردی.

**لە جیاتی بنەماڵە**

**هێرش محرم محمدامین**

**٢٠٠٩/١٠/٥**


برای بەڕێز کاک د. ئازاد حمد شریف
سلاو
سوپاست دەکەم بۆ ئەو ئەرکەی گرتوتە ئەستۆ سەبارەت بەو کتێبەی لەسەر باوکم ئامادەی دەکەیت.
ئێمە وەک بنەماڵەی ئەو شەهیدە بەوپەڕی توانامانەوە هاوکارت دەبین وە خۆشحاڵین لە بەرهەمەکەت شایستەی ئەو نووسەرە بێت بۆ خزمەتکردنی وشەی کوردی.
لە جیاتی بنەماڵە
هێرش محرم محمدامین
٢٠٠٩/١٠/٥



وێنەی (کەرەم محەمەد ئەمین) لە تانی لاویدا

# لە جیاتی پێشەکی: محەڕەم محەمەد ئەمین- نووسەری بە هەڵوێست و شەهیدی وشە

د. ئازاد حەمە شەریف

دیاردەیەکی یەگجار دانسقە و دەگمەنە لە ئەدەبی کوردی و رۆژهەلاتی دا نووسەرێك بتوانێت لە هەموو بوارەکانی نووسین دا بەقەد نووسەری شەهید (محەڕەم محەمەد ئەمین) بالادەست بێت. ئەم دەگمەنی و دانسقەییەش بۆ ئەو رۆشنبیرییە بەرفراوانە و ئەو ئەزموونە بەربلاوەی، کە نووسەر لە نیوەی یەکەمی ژیانیدا بەدەستی هێنابوو دەگەڕێتەوە. سەرباری ئەوەی کە ئەو رۆشنبیرێکی راستەقینە و راستگۆ بوو لەگەڵ خۆی و کۆمەڵگەکەی، مامۆستا (محەڕەم) هەموو ساتێك ئامادەبوو زۆر راستگۆیانە لە پێناو ئەو بیروباوەڕانەدا خەبات بکات، کە بڕوای پێیان هەبوو. هەر لە پێناوی ئەو بیروباوەڕانەشی بوو کە بەخشندانە سەری دانا.

نووسەری شەهید (محەڕەم محەمەد ئەمین) جگە لەوەی کە چیرۆکنووسێکی ورد و بەتوانا و دەسترەنگین بوو، رۆژنامەنووسێکی پلە یەك و وەرگێڕێکی دانسقەش بوو. چیرۆکەکانی ئەو نووسەرە ئازا و بوێرە نەشتەرناسا دیاردە خراپ و دزێوەکانی کۆمەڵگای سەردەمی خۆی بە تەکنیکی نوێباو و بە زمانێکی کوردی بەپێز و پتەوەوە پێشکێش دەکات. چیرۆکەکانی (مام هۆمەر)، (شای قەرەجان)، (مردووی زیندوو)، (پەتیارە) و (سەیرانێك لە ئەزمڕ) پڕاوپڕن لە خەم و مەینەتییەکانی مرۆڤی چەوساوەی ئەو رۆژگارە و هەر رستەیەك لەو چیرۆکانە هاوارێکی نارەزاییە بە رووی ستەم و زۆرداری ئەو سەردەمە. ململانێی چینایەتی و کێشەی نەتەوەیی دوو تەوەرەی

زۆر بایەخدارن لە سەرجەم چیرۆك و نووسینەکانی ئەم نووسەرە وێژدان زیندووە. چیرۆکەکانی (گردی شەهیدان) و نۆڤلێتی (رێگای ئازادی) دەنگی راستگۆیی نووسەرێکە، کە پەیامی خۆی بەچاکی بە خوێنەران دەگەیەنێت.

لەبەرئەوەی ئەدەب و رۆشنبیری هیچ میللەتێك بەبێ وەرگێران پێشناکەوێت، نووسەری رۆشنبیر (محەرەم محەمەد ئەمین) هەر زوو هەستی بەم راستییە کردووە و هەوڵی داوە ئەوەندەی لەتوانایدا بێت ئەم کەلێنە فراوانە بە وەرگێرانی کۆمەڵە بەرهەمێکی دانسقە و کاریگەر پڕ بکاتەوە. نیو سەدە پتر لەمەوبەر کە کەم نووسەری کورد هەبوون ناوی (دیستۆیڤسکی)یان بیست بێت، ئەو دەستی داوەتە وەرگێرانی رۆمانۆکەی (یادی گۆڕستانەکە) و پێشکێشی بە خوێنەرانی تامەزرۆی ئەدەبی جیهانی کردووە. ساڵێك دواتر کتێبی (شۆڕشی بەرزان)ی (هەمزە عەبدوللا)ی کردۆتە کوردی کە ئەمیش کەلێنێکی لە کتێبخانەی هەژاری کوردی پڕکردۆتەوە. ساڵی دواتر کتێبێکی زۆر بەسوود و کاریگەر و مێشك کەرەوەی وەرگێراوە کە (مەبدەئە بنەڕەتییەکانی فەلسەفە)ی جۆرج پۆلیتزەر و جی بێس و مۆریس کاڤینج بوو. ساڵی ١٩٧٢ کتێبێکی بەسوودی تر کە (مافی برینەوەی دوارۆژ بەپێی تیلایی چاوی یاسای دەوڵەتی) ی لە نووسینی (د. میسباحەدین خیرۆ)ی لە عەرەبییەوە کردۆتە کوردی. هیچ گومانی تێدا نییە کە وەرگێرانی ئەم چوار کتێبە بەشێك بووە لە خەباتی شۆڕشگێڕانەی مامۆستای شەهید (محەرەم محەمەد ئەمین)، چونکە هەر چواریان بەرهەمی مرۆڤانی پێشکەوتنخواز و شۆڕشگێڕ بوون و بۆ ئەو سەردەمەی رۆشنبیرانی کورد لە پێویست پێویستتر بوون.

خۆ ئەگەر سەیرێکی نووسینە رۆژنامەوانییەکانی ئەو نووسەرە بلیمەتە بکەین و بەوردی لێیان بکۆڵینەوە دەگەینە ئەو راستییەی کە چ وەرگێرانەکان و چ چیرۆکەکان و چ بابەتە رۆژنامەوانییەکان هەر هەموویان بەدەوری بابەتی پێشکەوتنخوازی و شۆڕگێڕیدا خوول دەخۆن. ئەو بابەتانەی کە نووسەر لە رۆژنامە و گۆڤارەکانی ساڵانی پەنجا و شەست و حەفتاکانی سەدەی رابردوو بەتایبەتی لە رۆژنامە و گۆڤارەکانی (ژین)، (بلێسە)، (رۆژی نوێ)، (بەیان) و (سلێمانی) و ئەوانی تر بڵاوی کردوونەتەوە باشترین بەڵگەن بۆ ئاستی

بەرز و مێشکی فراوانی ئەم نووسەرە دڵسۆزە بۆ کورد و کوردایەتی و مرۆڤایەتی. ڕێزە نووسینەکانی نووسەر لەبارەی "جەژنی نەورۆز" و یادکردنەوەی شۆڕگێڕانی کورد وەکو "حەمە قودسی" و خەباتی گەلانی بەشخوراو وەکو "گەلی ئیرلەندا" و داواکردن بۆ "سەربەستی ئافرەت" و داکۆکیکردن لە مێینە و ژنانی بەشخوراوی ڕۆژهەڵاتی هەمیشە لەودیوو بیرکردنەوەی نووسەری شەهید (محەرەم محەمەد ئەمین) بوون.

بابەتەکانی تر کە لە بارەی "فەلسەفەی چیرۆك" و "هونەری چیرۆك" و "چیرۆك لە مێژوودا" و "زانستی دەروون و ئەدەب" و "بیرکردنەوەی عیلمی" و "پەیدابوونی کۆمەڵی مرۆڤایەتی و پێشکەوتن" و دەیان بابەتی تر کە، یان بەخۆی نووسیوویێتی، یان وەریانی گێڕاون، بۆ کردنەوەی مێشکی خوێنەری کورد و فراوانکردنی ئاسۆی بیرکردنەوەی ڕۆشنبیرانی ئەو سەردەمە گەورەترین کاریگەریان هەبوو.

ئەوەی یەکجار تووشی سەرسوڕمانی کردووم ئەوەیە کە بۆچی دەیان نووسەری تری زۆر لە خوارەوەی نووسەری شەهید (محەرەم محەمەد ئەمین) هەن کۆڕ و سیمینار و ڕێزلێنان و فێستیڤاڵیان بۆ سازدراوە و کتێبیان لەبارەوە چاپکراوە و گەیەنراونەتە کەشکەلانی فەلەك کە نەك ئەوان ئاستی نووسینیان بەقەد ئەو بەرز نەبووە، بەڵکو بگرە تۆزقاڵێك بەقەد ئەو دڵسۆز نەبوون بۆ کورد و کوردایەتی و مرۆڤایەتیش.

ئایا وەڵامی ئەو پرسیارە ئەوەیە کە میللەتی کورد تەنیا ڕێز لە کەسە بێ توانا و نادڵسۆز و خۆفرۆشەکان دەنێت و نووسەر و ڕۆشنبیرانی بلیمەت و دڵسۆز و پایەبەرز هەمیشە دەبێت بەوە چاکەیان بدرێتەوە کە، یان پشتگوێ بخرێن، یان بە دەردی (دەروێش عەبدوڵلا)کەی (گۆران) ببردرێن:

بەڵێ دیارە، لە ناو قەومی بەسیتا قەدری سنعەتکار
وەکو عەکسی قەمەر وایە لەناو حەوزێکی لیخندا،*

---

* گۆران،دیوانی گۆران ( بەرگی یەکەم) کۆکردنەوەی محەمەد مەلا کەریم (بەغدا: چاپخانەی کۆڕی زانیاری عیراق، ١٩٨٠) ل ١١٩

هاوار و فیغانی (هێمن)ی شاعیریش بۆ خۆی و بۆ هەموو هونەرمەندان و شاعیران و ڕووناکبیران و ڕۆشنبیرانە، چونکە نووسەرانی ڕاستگۆ و دڵسۆز هەمیشە لەناو میللەتانی دواکەوتوو بەهۆی دەسەڵاتدارانەوە تووشی کێشە و ئازێشە کراون. لە ژیاندا ئەوەندە ئازار دەدرێن کە تامی هەموو شتێکی خۆش لە بیر بکەن:

بزانە تۆ ئەوی ئەهلی هونەر بێ
دەبێ یا دەسبەسەر یا دەربەدەر بێ
هونەرمەند و ژیانی خۆش محاڵە
هونەرمەند ڕەنجەڕۆیە ، ژینی تاڵە ![*]

کەواتە هیچ سەیر نییە ئەگەر دوای ٣١ ساڵ بەسەر تێپەڕینی شەهیدکردنی ئەو نووسەرە بلیمەتە کە گەورەترین خزمەتی ڕووناکبیری لە کاتە هەرە تاریکەکاندا پێشکێش بە میللەتەکەی خۆی کردووە و سەری لە پێناو وشە و ڕاستگۆیی دانا و بەدەستی بەعسییەکان دوای لێپێچانەوە و ئەشکەنجەدانێکی زۆر لەلایەن دایەرەی ئەمنی سلێمانییەوە لەناوبرا، تا ئێستاش بەبەردەوامی لە ویژدانی هەمووماندا شەهید دەکرێتەوە و کەسیش یادی نەکاتەوە.

سڵاو ئەی برای شەهیدم کاکە (محەڕەم)، ڕەنگە هەمان چارەنووس خۆی بۆ هەموو ڕووناکبیرێکی ویژدان زیندووی دەسەڵاتنەخوازی ئەم وڵاتە دانووساندبێت و تا ئەو ڕۆژەی ویژدانی خەوتووی ئەم خەڵکە واگادیتەوە، تۆش پشووێك بدە و پێلووی چاوانت لێك بنێ و ئێمەش وا خەریکە بۆ لای ئێوە بەڕێ دەخرێین.

**هەولێر ٢٠١١/٢/١٥**

---

* هێمن موکریانی،بارگەی یاران (بەرگی یەکەم) بەسەرپەرشتی: بەدران ئەحمەد و عوسمان دەشتی (هەولێر: چاپخانەی وەزارەتی پەروەردە، ٢٠٠٣) ل١٠٦

## ژیانامەی محەڕەم محەمەد ئەمین

* لە ساڵی ١٩٢١ لە گەڕەکی دەرگەزێنی سلێمانی لەدایك بووە.

* لە ساڵی ١٩٣٦ قوتابخانەی سەرەتایی تەواو کردووە.

* لە ساڵی ١٩٤٣ قوتابخانەی دواناوەندی تەواو کردووە.

* پانزە رۆژ لە کۆلێژی حقووقی بەغدا خوێندوویەتی، بەڵام لەبەر هەندێ تەنگوچەڵەمەی تایبەتی بەجێیهێشتووە.

* لەساڵی ١٩٤٤ لە دایەرەی تەموینی سلێمانی وەرگیراوە.

* لەساڵی ١٩٤٥ لە دایەرەی مەعاریفی سلێمانی بووە بە مووچەخۆر، لەپاشانادا بووە بە ئەمینداری نامەخانەی گشتیی سلێمانی.

* لەساڵی ١٩٤٨ گوێزراوەتەوە بۆ قەزای (الخالص)، تا ساڵی ١٩٤٩ ئەمینداری نامەخانەی گشتی بووە.

* لەساڵی ١٩٥٢ تا ساڵی ١٩٥٦ لەدایەرەی قەڵاچۆکردنی مەلاریا لەسلێمانی دامەزراوە.

* لەساڵی ١٩٦٠ — ١٩٦١ دەستەی نووسەرانی گۆڤاری (ڕۆژی نوێ) بووە.

* لەساڵی ١٩٥٧ لەدایەرەی شارەوانی (بەلەدیە)ی سلێمانی بە مووچەخۆر دامەزراوە و دواتر بۆتە سەرۆکی شارەوانی.

* لەساڵی ١٩٧٥ لە دەزگەی (هاوکاری) بۆ چاپ و بڵاوکردنەوە سەرنووسەری گۆڤاری (بەیان) بووە.

* زمانی کوردی و عەرەبی و ئینگلیزی دەزانی، بەڵام چیرۆکەکانی بەکوردی دەنووسین و هەندێ چیرۆکیشی لە عەرەبییەوە کردۆتە کوردی، بەتایبەتی

چیرۆکەکانی گۆگۆڵ و گۆرکی و دیستۆیڤسکی، جگە لەبابەتی ئەدەبی و فیکریی و سیاسی و زانستی دی.

* چەندین وتار و نووسین و رەخنەی ئەدەبی و بیرەوەری لە رۆژنامە و گۆڤارە کوردییەکان (بەتایبەتی لە ژین و رۆژی نوێ و بڵێسە و شەفەق و نەورۆز و بەیان)دا بڵاوکردۆتەوە.

* ساڵی ١٩٧٧ خانەنشین بووە.

* هەر لەسەرەتاشەوە تێکەڵی کۆڕی تێکۆشان بووە و لەپێناوی ئازادی و یەکسانی گەل و مرۆڤایەتیدا زیندانی کراوە و سزای نۆشیوە.

* دوای لێپێچانەوە و ئەشکەنجەدانی لەلایەن دایەرەی ئەمنی سلێمانییەوە، لەرۆژی ٢٣ی تەمووزی ساڵی ١٩٨٠دا، بۆ دواجار ماڵئاوایی کرد.

**کتێبە چاپکراوەکانی:**

**١ـ لە بواری چیرۆکنووسیندا**

* مام هۆمەر ـ یەك چیرۆکە ـ هەولێر ـ ١٩٥٤.

* گۆمی شڵەقاو ـ دوو چیرۆکە (سەیرانێك لە نەزمەڕ) و (زیندووی مردوو) بەغدا ـ ١٩٥٧.

* گردی شەهیدان ـ یەك چیرۆکە ـ سلێمانی ١٩٥٨ چاپی دووەمی لەلایەن مەحموود خاکییەوە ساڵی ١٩٧٠کراوە.

* رێگای ئازادی ـ چیرۆکێکی درێژە ـ سلێمانی ـ ١٩٥٩.

* ئادەمیزاد ـ سێ چیرۆکە (پەتیارە) و (شای قەرەجەکان) و (بۆ خۆیی) سلێمانی ١٩٦٩.

**٢ـ لە بواری وەرگێڕاندا**

* یادی گۆڕستانەکە (نووسینی دیستۆیڤسکی) بڵاوکراوەکانی کتێبخانەی گەلاوێژ ـ سلێمانی ١٩٥٨.

* شۆڕشی بەرزان (نووسینی هەمزە عەبدوڵڵا) بڵاوکراوەکانی نامەخانەی خەبات ـ سلێمانی ١٩٥٩.

* مەبدەئە بنەڕەتییەکانی فەلسەفە ـ سلێمانی ١٩٦٠.

* مافی بڕینەوەی دوارۆژ ـ سلێمانی ١٩٧٢.

**ئەو چیرۆکانەی لە رۆژنامەو گۆڤارەکاندا بڵاوکراونەتەوە:**

* زیندووی مردوو: یەکەمین چیرۆکی بڵاوکراوەی چیرۆکنووسە ـ رۆژنامەی ژین، ژمارە ١١٧٤- ١٩ی نۆڤەمبەری ١٩٥٣.

* شای قەرەجەکان، گۆڤاری رۆژی نوێ، ژمارە ١١ی شوباتی ١٩٦١.

* بۆ خۆیی، رۆژنامەی ژین، ژمارە ١٦٧١، ٤ی نیسانی ١٩٦١.

* پەتیارە، گۆڤاری سلێمانی، ژمارە٨، ك ٢ی ١٩٦٩.

* خوێن و بەفر، گۆڤاری بەیان، ژمارە ٢٥، ساڵی ١٩٧٥.

* هەر خواردیانەوە ـ رۆژنامەی هاوکاری، ژمارە ٢٩٨، ساڵی ١٩٧٦.

* سلاوێکی پێکەنیناوی، رۆژنامەی هاوکاری، ژمارە ٤٣٤ ساڵی ١٩٧٨.

* هەڵپەرکێیەك لە بلکیان، گۆڤاری ئاسۆی زانکۆیی، ژمارە ٣ ساڵی ٤ - ١٩٧٩.

* ئاوگێران.

* شانۆنامەی (جنۆکە لە قەفەزی تاوانباریدا) رۆژنامەی (ژین) ژمارە ٣٦، رۆژی ١٩-٨-١٩٧١.

# پێشەکی کۆکاری کتێبی (محەرەم محەممەد ئەمین، کۆبەرهەمە ئەدەبی و سیاسی و فەلسەفیەکان )

رەئوف حەسەن
٢١ی ئایاری ٢٠٠٧

هەروەکو خولیا و ئاواتێکی ژیانی مامۆستا محەرەم محەمەد ئەمین خۆی، کە هەمیشە خۆزگەی ئەوەی دەخواست هەموو بەرهەمە جۆراوجۆرەکانی نێو گۆڤار و رۆژنامەکان، تەنانەت کتێب و نامیلەکانیشی، لە دووتوێی کتێبێکدا بەکۆکراوەیی لەبەر دەستی خوێنەرانی کورددا بووایێ، چونکە مەگەر هەر خۆی بیزانیایە ئەو بەرهەمانەی چەند پەرتەوازەن و چەندێکیش مەترسی ونبوون و لەناوچوونیان لێدەکرێت. ئەوەتا هەروەکو لەو وتارەی مامۆستا مستەفا سالح کەریم رۆژی ١٩٨٠/٨/٢٨ لە باخچەی یەکێتی نووسەرانی کورد لە سلێمانی. لە کۆڕی چلەی دوامالئاوایی مامۆستادا خوێندییەوە.. دەڵێت: (لە ناوەندی ئەمووزی ئەم ساڵدا... "واتا نزیکەی مانگ و نیوێك بەر لە مردنی" ئێوارەیەك یەکترمان دی.. بەدوور و درێژی باسی ئەو پرۆژە ئەدەبیانەی بۆ کردم کە بەدەستییەوەیەتی، هەروەها وتی: کاك عومەر مارف بەرزنجەییم راسپاردووە چیرۆکەکانم بۆ کۆبکاتەوە.. بەنیازم بیانخەمە ژێر چاپەوە، هەروەها وتی: خۆزگەم بمتوانیایە وتارەکانیشم لە رۆژنامە و گۆڤارەکاندا کۆبکەمەوە و چاپیان بکەم).

نە هەر ئەمە، بەڵکو زۆربەی نووسەر و باسکار و توێژەرانمان لەو بڕوایەدان، تەنانەت ئەو بەرهەمانەیش بە نامیلکە و کتێب بڵاوبکردوونەتەوە پێویستە جارێکی

دی و هەموویان پێکەوە لە چاپێکی جواندا کۆیکرێنەوە. تەوەتا د. مارف خەزنەدار لە بەرگی حەوتەمی کتێبەکەیدا (مێژووی ئەدەبی کوردی)، دەڵێت: (سەرجەمی بەرهەمی مەحوی و حەمدی و ئەحمەد ئەمین پێویستیان بە کۆکردنەوە هەیە).

بێگومان چ د. مارف خەزنەدار و، چ باسکار و رەخنەگرانی دیکەی ئەدەب و کولتووری کوردی.. وەك هێژایان (حوسێن عارف) و (عومەر عارف بەرزنجی) و (سەباح غالب) و (جەمشید حەیدەری) و دەیانی دیش، بەتایبەتی خوێندکارانی بەشی زمان و ئەدەبی کوردی زانکۆکان.. لە پشکنین و گەڕانیان بەدووای بەرهەمەکانیدا دووچاری ماندوێتی و تەنانەت دەردیسەریش بوون .. ئەمجا گەلێکیشیان چنگ نەکەوتوون و.. من خۆم چەند ساڵێك بەر لەوەی دەستبکەمە گەڕان بەدووای بەرهەمەکانیدا و دەست بدەمە کۆکردنەوەی سەرجەمیان، دووچاری ئەم کێشەیە بووم و.. تەنانەت ئەو کتێب و نامیلکانەی بە دەستی خۆی و بە ئاگاداری من و برادەرانی و بە چەندین نوسخە پێشکێشی کتێبخانەی گشتی سلێمانی کردبوون، هەندێکیان لەوێشدا نەماون! تا ئەو ڕادەیەی سۆراخکردن و بە زەحمەت دۆزینەوەی یەکدوو کتێب، چاپکردنی ئەم کۆبەرهەمەی بۆ چەندین مانگ دواخست.. ئەمە وێڕای ئەوەی بەهۆی تێپەڕبوونی نیو سەدە و زیاتریش، بەسەر ئەو وتار و بابەتانەیدا کە لە هەندێ ڕۆژنامە و گۆڤاردا بڵاویکردوونەتەوە.. لە کاتی دۆزینەوە و فۆتۆکردنیاندا لاپەرەکان بەدەستەوە هەڵدەوەرین و کارەکە هێندەی دی گرفتاوی دەبوو.

لەگەڵ هەموو ئەمانەشدا.. ئێمەیش لەو بڕوایەداین دۆزینەوە و کۆکردنەوە و چاپ و بڵاوکردنەوەی سەرجەم بەرهەمەکانی، کارێکی پێویستە و.. بەمەیش خۆزگە و ئاواتە دێرینەکەی ئەم نووسەرە بەسەلیقە و قەڵەم جوان و بەبڕشتە دێنینەدی.. بێگومان ئەمەیش لێبڕان و هیمەتێکی ئەمەکدارانە و دڵسۆزانەی گەرەکە و.. هەر ئەمانەیش بووە هۆی سەرەکی و مایەی ئەوەی کاتێکی زۆری بۆ تەرخانکەم و لێبڕاوانە دەستبکەمە پشکنین و گەڕان بەدووای نووسینەکانیدا و.. هێندەی بتوانم هەوڵبدەم ئەو ڕەنجەی داوێتی، بە پەرش و بڵاوی لەملا و ئەولا نەمێنێتەوە.. بەئاسانی بکەوێتە بەردەستی خوێنەر و باسکار و

ڕەخنەگران.. دەبێ ددان بەوەشدا بنێم بەدەگمەن ئەمجۆرە کارانە بێ کەموکووڕی دەردەچن و بێگومانم ئەگەر کیماسییەکانی ئەم کۆبەرهەمە زۆر کەمیش بێ، وەلێ هەر سەددەرسەد تەواو نییە.. لەوانەیە بەرهەمی بڵاونەکراوەی لە دەزگەیێکی چاپ و بڵاوکردنەوەدا، دەستنووسێکی لای کەسێك مابێت یان فەوتابێ.. یاخود لە کاتی گەڕانمدا بە چاپەمەنییەکاندا بابەتێکم بەرچاو نەکەوتبێ.. یا.. یا.. بەهەرحاڵ هەوڵمداوە کەموکووڕییەکان دەگمەن بێ.. یان کەمترین کیماسی تیابێ.

❊ ❊ ❊

محەرەم هەتا بڵێی پیاوێکی جوان و خوشەویست و سادە و دڵ و دەروون پاك و قسەخۆش و خۆشمەشرەب و تێکۆشەرێکی پێشکەوتنخواز و نیشتمان پەروەرێکی دڵسۆز و کوردپەروەرێکی بێ غەڵ و غەش بوو.. ژیان و تێکۆشان و بەرهەمەکانی و سەردەمەکەش پڕاوپڕی گەواهی ئەم ڕاستییە دەدەن.. ئەو سەردەمەی بیروباوەڕی سۆشیالیزم و مارکسیزم نموونەی بەرزی باڵای لاوە پێشکەوتنخواز و مرۆڤدۆستەکان بوو لەلایێك و.. لەلایێکی دیەوە هوشیاری بزاڤی نەتەوایەتی (کوردایەتی) لە لووتکەی گەشەسەندنیدابوو.. محەرەم وەك لاوێکی ئەو سەروبەندە عاشقێکی کەموێنەی مەبدەئە بنەڕەتییەکانی مارکسیزم بوو.. هەروەکو چۆن دڵسۆزێکی ڕاستەقینەی پارتی دیموکراتی کوردستان و شۆڕشی ئەیلوول و پێشەواکەی (بارزانی) نەمر بوو و.. بە هەموو شێوەیەك لە بەرامبەر دوژمنان و کۆنەپەرستانی بێگانە و ناوخۆدا بوێرانە و بابەتیانە داکۆکی لە کێشە ڕەواکەی نەتەوەکەی و پێشەواکەی و کێشە مرۆڤایەتییەکان دەکرد.. هەروەهاش شەیدا و دڵسۆزێکی ڕاستەقینەی شۆڕشی چواردەی تەمووز و پێشەوا عەبدولکەریم قاسم بوو.. تا ئەو ڕادەیەی بە چیرۆکی (ڕێگای ئازادی) تۆمارێکی ئەدەبی شۆڕشی چواردەی تەموز و کەسێتی قاسم دەکات و.. قاسمیش وەك ڕێزلێنانێکی ئەم ئەدیبە کوردە.. وێنەیەکی خۆی بە ئیمزای خۆیەوە و چەند دیارییەکیشی پێشکێش دەکات.

❊ ❊ ❊

سەرەتای چیرۆکنووسی محەرەم بە چیرۆکی (زیندووی مردوو) دەست پێدەکا.. هەر لەم دەسپێکەی ساڵی ١٩٥٣ وە، دەسترەنگینی لەم هونەرە گرینگەدا دەرکەوت و.. لەوساوە شکۆمەندانە کەوتە نێو دنیای چیرۆکی کوردییەوە و.. شان بەشانی هاورێ چیرۆکنووسەکانی پێش خۆی و دوای خۆی وەك (عەلادین سەجادی) و (شاکر فەتاح) و (برایم ئەحمەد) و (حەسەنی قزلجی) و (مارف بەرزنجی) و (کاوس قەفتان) و (محەمەد رەسوڵ هاوار) و (کامەران موکری ـ شاعیر) و (جەلال مەحموود عەلی) و... هەروەها (ساجید ئاوارە) و (مستەفا ساڵح کەریم) و (عەبدوڵڵا میدیا) و (محەمەد مەولوود مەم) و (مارف خەزنەدار)، (کاکە مەم بۆتانی) و... تاد، شان بەشانیان و تەنانەت لە پێشەوەی هەندێکیشیانەوە، پایە تۆکمەکانی ئەم هونەرەی چەسپاند و.. چیرۆکەکانی (سەیرانێك لە ئەزمڕ) و (شای قەرەجەکان) و (زیندووی مردوو) و (پەتیارە) و (هەر خواردیانەوە) ، (سلاوێکی پێکەنیناوی) و... تاد، وێڕای ئەوەی هەر یەکەیان بە جۆرێك لە جۆرەکان نموونەی بیرۆکەی گونجاو و جوانی کورتە چیرۆکن و هەر یەکەیان هەڵگری جۆرە نهێنی و سیحر و شێوازێکی هونەرین.. لە هەمان کاتیشدا لە مێشك و خەیاڵی خوێنەراندا دەمێننەوە و لەیادناچنەوە.

دەتوانین زۆر بەکورتی و لە چەند خاڵێکدا دەستنیشانی خولیاکانی چیرۆکەکانی بکەین:

١ـ دەرخستنی خەم و خولیا و کێشەکانی مرۆڤی هەژار و ڕەنجدەری سادە و برسی نێو میللەت و نەهامەتیەکانی گەڕان وەدووی نان پەیداکردندا.. وەك چیرۆکی (مام هۆمەر) و (پەتیارە).

٢ـ قۆشمەیی و ئیسکسووکی و نووکتە و خۆشمەشرەبی هەمان ئەو مرۆڤە سادە و میللیانەی نێو نەتەوەکەمان.. وەك چیرۆکی (سەیرانێك لە ئەزمڕ) و (بۆخۆیی) و (هەر خواردیانەوە) و هەروەها (پەتیارە)یش.

٣ـ خەبات و کوردایەتی.. وەك (شای قەرەجەکان) و (گردی شەهیدان).

٤ـ پێشکەوتنخوازی و نیشتمانپەروەری.. وەك (ڕێگای ئازادی) و (زیندووی مردوو).

٥ـ عەشق و ئەوین.. وەك (هەڵپەڕكێیەك لە بلكیان).

❋ ❋ ❋

لێرەدا نابێ ئەوەش فەرامۆش بكەم كە نووسەر گەرچی تاكە كورتە شانۆنامەیەكی بەناوی (جنۆكە لە قەفەزی تاوانباریدا) نووسیوە.. وەلێ لەو دووسێ لاپەڕەیەدا توانیویەتی بابەتێكی هزرهەژێنی زانستیانە و پڕ لە توانج و تەشەر لە بیروبۆچوونی كۆنەپەرستی و خورافیات و بەشێوازێكی زۆر ناسان و گونجاو، هەروەها پڕ لە موفارەقە بخولقێنێ.. كە دەتوانرێ بۆ گەلێ بۆنەی میللی و تەنانەت لە خوێندنگە سەرەتاییەكانیشدا و بەبێ هیچ ئەرك و خەرجییەك دەربهێنرێ و پێشكەشبكرێ.

❋ ❋ ❋

كارەكانی محەرەم گەرچی لە بواری وەرگێڕاندا كەمن.. وەلێ پوخت و مەبەستدارن.. ئەو بابەتانەن خۆی خولیایان بووە و.. بەقەڵەمی خۆیشی كەم تا زۆر لەبارەیانەوە نووسینی جوان و هەڵسەنگاندنی وردی هەیە.. واتا ئەو بابەتانەی هەڵبژاردووە كە بڕوای پێیان هەبووە و.. تەنانەت قوربانیشی لەپێناویاندا داوە.. وەك:

یەكەم: لە بواری چیرۆكدا.. چ وەك چیرۆك یان رۆمان خۆی.. وەك (یادی گۆڕستانەكە)ی مەزنە رۆماننووسی جیهانی (دیستۆیڤسكی) و.. چ وەك هونەر و فەلسەفەی چیرۆك.. كە بەو دوو ناوەوە دوو وتاری وەرگێڕاوە.

دووەم: بابەتی شۆڕشی و مێژووی كورد و داكۆكیكردن لە نەتەوەی كورد.. چ ئەوانەی كوردان بە عەرەبی نووسیبێتیان، یان هی بێگانە.. تا بەزمانی كوردیش لەبەر دەست و چاوی خوێنەری كورددا بن.. وەك:

١ـ شۆڕشی بەرزان ـ نووسینی (هەمزە عەبدوڵڵا)

بێگومان ئەم بابەتە نرخ و بەهای گرینگی خۆی هەیە و.. هەر ئەو لێقرتاندن و قەدەغەكردنی ئەو هەموو بڕگانەی لەلایەن سانسۆرەوە قرتێنراون و ئاماژەیان پێدراوە، بەڵگەی مەزنی بابەتەكەن و تەنانەت سڵەمینەوەی دەسەڵاتیشە لێی.

٢ـ مافی برینەوەی دوارۆژ.. پێشەکییەکەی وەرگێڕ (محەرەم).. کە سەرتاسەری بۆ ئەو مەبەستەیە کە یەکلاییکردنەوەی کێشەی کوردیش وەك کێشەی گشت نەتەوە بندەستەکانی دی جیهان کارێکی نێودەوڵەتی گەرەکە.. تا کوردیش وەك مافێکی سادە و ئاسایی خۆی دەوڵەتی سەربەخۆی خۆی هەبێ و.. هەر خۆیشی ئەو سیستمی حوکمڕانییە هەڵبژێرێ کە لەگەڵ بارودۆخەکەیدا دەگونجێ.. وێڕای ئەم پێشەکییە.. ئەو (مافی برینەوەی دوارۆژە)دە.. کە کۆمەڵە بڕیارێکە و وەك یاسایەکی نێودەوڵەتی بۆ نەتەوە مافخوراو و داگیرکراوەکان کاری پێدەکرێت.. بۆچ ڕۆڵەکانی نەتەوەکەمان لێی بێئاگابن؟ بەئاگایی لە مافەکان و لە قەبارەی ئەو زوڵمانەی کراون، ورەی مرۆڤ بۆ لابردنی زوڵمە و، وەدەستهێنانەوەی مافە زەوتکراوەکانی بەرز دەکاتەوە و.. گیانی کۆڵنەدانی پێدەبەخشێ.. ئەمە وێڕای ئەوەی هەر لێرەدا ئەو فێڵ و فەرەج و پێچە بەدەورییەش ڕووندەکاتەوە، کە چ زلهێزەکان و چ وڵاتانی دەوروبەر دەیانەوێ لەو یاسا نێودەوڵەتییەی بکەن، بۆ ئەوەی نەتەوەی کوردی لێ بەهرەمەند نەبێ.

٣ـ ڕۆژنامەی (الثورة) داوای توانەوەی گەلی کورد ئەکا.. کە لە ڕۆژنامەی (خەبات)دا (کوردپەروەرێك) بەعەرەبی ڕەددی وتارێکی (الثورة)ی دابووەوە.. کە بەهەناسەیەکی شۆڤینیانە دژی نەتەوەی کورد - وەك کەمە نەتەوایەتییەك - نووسرابوو.. محەرەم کردویەتییە کوردی.. ئەوەی بەڕاستی لێرەدا مایەی سەرنجە ئەوەیە .. ئەو هەناسە شۆڤینیستانەیەی لەو وتارەی ڕۆژنامەکەدا هەستپێدەکرێت، کە نزیکەی نیو سەدە لەمەوبەر نوسراوە، هەمان هەناسە و بۆچوونی شۆڤینیستانەی عەرەب بەرامبەر بە کورد تا ئەم ڕۆژگارەش بە هەمان پلە و ئاست، بگرە توندتریش درێژەی هەیە .. واتا بابەتەکە — بەداخەوە - هێشتا هێندە گەرموگوڕە زۆر بەجوانی دەکرێت سوود لە وەڵامەکە وەرگرین بۆ بەرپەرچدانەوەی هەر بیروبۆچوونێکی هاوشێوەی وتارەکەی (الثورة)ی ئەوسا..

محەرەم جگە لەم وەرگێڕانەشی.. بەهەمان بیروبۆچوونی کوردپەروەرانەی خۆی چەندین وتاری لەم بارەیەوە نووسیوە.

سێیەم: بیرکردنەوەی زانستیانە و تێڕوانینی سەردەمانە بۆ سەربەستی ئافرەت.. کە دوو بابەتی لێکدانەبڕاون و.. لە هەردووکیاندا زۆر بەوردی وەهم و خورافیات و خەیاڵ لەلایەك و .. زانست و شارستانێتی و پێشکەوتنخوازی لەلایێکی دی، لە یەکدی جیادەکاتەوەو.. هەروەها هەر خۆیشی چەندین وتاری لەم بارەیەوە نووسیووە و بڵاوکردۆتەوە.. بەتایبەتی ئەو داکۆکییە بوێرانەیەی لە سەربەستی ئافرەت.. کە دەستەی زانایانی ئیسلامی سەغڵەتکرد و لێی هاتنە جواب.

چوارەم: کێشەی لاوان: ئەگەر بەوردی بڕوانینە ئەو نامەیەی (کۆلییێڤ)ی شاعیری سۆڤییێتی بۆ (میرێل)ی نووسەری قەرەنسایی نووسیوە و وەڵامەکەی (میرێل)یش.. ئەوجا دەزانین محەرەم لە هەڵبژاردنی بابەتە وەرگێڕدراوەکانیدا چەند وریا و لێزان و تەنانەت دوورناسیش بووە.. لەوێدا جۆرە هەڵسەنگاندنێکی کێشەی لاوان دەبینین کە لەم سەردەمەدا و لای ئەوانەی خۆیان و قەڵەمیان بۆ تەرخانکردووە، نە هەر بەلای ئەو بۆچوونانەدا ناچن.. بەڵکو لاوان چەواشەش دەکەن.. لەو دوونامەیەدا زۆر بوێرانە ددان بەوەدا دەنێن ئەزموونەکانی ئەوە پێشەنگەکان (یان پیران) بە کەڵکی ژیانی ئەمڕۆی گەنجان نایەن و بێسوودن.. ڕاستە گەنجان پێویستیان بە ئامۆژگاری پیران نییە.. بەڵام (ڕەگەزپەرستی تەمەن) نەخۆشییەکی سایکۆلۆژییە.. هەموو پیران نەخەڵەفاون و هەموو گەنجانیش لەسەر هەق نین.. موجامەلە و مەراییکردنی (وەك مۆدەی) گەنجان لە لایەن پیرانەوە نەخۆشییە.. زۆر بوێرانەتر ئاماژە بەوەدەدەن ئێستا لاوان بڕوایان بە ئاین نەماوە.. لەهەمان کاتیشدا شتێکی دی (فەلسەفەیەك) نییە ئەو بۆشاییەیان بۆ پڕبکاتەوە.. نهێنییەکانی ژیانیان بۆ ڕوونبکاتەوە.. لەو ڕاڕاییەدا بەتەنیا ماونەتەوە!!

❊ ❊ ❊

محەرەم لەبواری ڕۆژنامەوانیدا بەراستی وێڕای ئەوەی بەرهەمی جۆراوجۆری زۆرە.. کارامە و لێزانیش بوو.. لە گەلێ گۆڤارو ڕۆژنامەدا نەك هەر وتار بڵاوکردنەوە و بەس.. بەڵکو وەك کادیرێکی ڕۆژنامەوان کاری تێیاندا کردووە.

له کۆتایی پەنجاکانی سەدەی رابردوودا و لە رۆژنامەی (ژین)دا.. شانبەشانی مامۆستایان (د. مارف خەزنەدار) ، (مستەفا سالح کەریم) ، (دیلان) و (ئەحمەد زرنگ).. کە بەم ناونیشانانە یەك لە دوای یێك (خۆراکی گیان) و (ئاوێنەی ژیان) و (ئەوەی ئامانجمانە) و (رازوخوازی ئەم مانگە).. گۆشەی مانگانەیان هەبوو و.. بەوێنەی خۆیشیانەوە بلاویان دەکردنەوە.. مامۆستا محەرەمیش بە ناونیشانی (رێگای راست) و بەوێنەی خۆیەوە گۆشەیەکی بۆ تەرخانکرابوو.. بەنیازبوو لە گۆشەکەیدا و بە زنجیرە نووسین گیروگرفتە کۆمەلایەتییێکان بەشێوازێکی زانستیانە و لەژێر رۆشنایی فیکر و فەلسەفەی مارکسیزمدا شیبکاتەوە.. لەبەرئەوەی لە سەردەمی پاشایەتیدا ئەم جۆرە نووسینانە بقە و قەدەغە بوون بۆیێ هێجگار تینووی ئەم شێوازە بیرکردنەوەیە بوو.. ئەگەرچی مستەفا سالح کەریم دەلێت: زنجیرەەك وتاری لەو گۆشەیەدا بلاوکردۆتەوە - وەلێ هەرچەند گەرام لە دوو گۆشە زێترم نەدۆزییێوە و نازانم بۆچی گۆشەکەی بەردەوام نەبوو!؟ لە بیریشمان نەچێ مامۆستا چەندین وتاری دی بە هەمان ناونیشانەوە لە دەڤەری گۆشەکەیدا — بلاوکردۆتەوە .. دیارە زۆر بە ناونیشانی (رێگەی راست، رێگەی ئازادی، رێگەی خەبات ... تاد)ەوە سەرسام بووە.

هەر لە بواری رۆژنامەوانیدا و.. لە سەرەتای شەستەکانیشدا، وێرای ئەوەی دەستەی نووسەرانی گۆڤاری (رۆژی نوێ) بوو.. تاکوتەرا نەبێت ژمارەی نییە وتاری تێدا بلاونەکردبێتەوە.. بەتایبەتی ئەو لێکۆلینەوە سیاسییەی بە ناونیشانی (ئەو کارەساتانەی لە سالی رابردوودا روویان داوە) و.. یادی (رۆژی ١٩ی حوزەیران) و (لەبەر بلێسەی مەشخەلی نەورۆزدا....)..تد.

له سالی ١٩٧٥ یشدا سەرنووسەری گۆڤاری (بەیان)بوو.. بەر لەویش لە کۆتایی شەستەکاندا چەندین سەروتار و وتاری لە گۆڤاری (سلێمانی)دا نووسیوە.. وەك (ئامانج و رێگا) و (بەرژەوەندی خۆیی پێویستە لە چوارچێوەی بەرژەوەندی گشتیدابێ)و.. تاد.

* * *

محەرەم لە وتارەکانیدا پەلی بۆ گەلێ بابەتی جیاجیا بردووە.. بەتایبەتی لە بواری ڕەخنەی ئەدەبی و پێشەکی نووسین و یاد و بیرەوەری نەمرانی نەتەوەدا و..تاد، لە دووتوێی ئەم کۆبەرهەمەدا هەموویانت بەرچاو دەکەون.. وەلێ ئەوەی مایەی سەرنجە، ئەو وتارانەیەتی بەبۆنەی (نەورۆز)ەوە نووسیونی و.. زۆرترین وتاری جۆراوجۆری بۆ ئەو جەژنە نەتەوایەتییە تەرخانکردووە.. هەروەکو ئەو خۆی خاوەنی ڕاستەقینەی ئەو جەژن و بۆنەیەبێ وایە.

هەروەها بەوپەڕی ڕاشکاوی و بێ پێچ و پەنا دڵسۆزێکی شەیدا و ڕاستگۆی نەتەوەکەی و ڕێبازی کوردایەتی و پێشەوا تێکۆشەرەکانی بەتایبەتی (بارزانی) نەمر بوو، هەروەکو چۆن خۆی لە دووتوێی بیری مرۆڤدۆستانە و پێشکەوتنخوازانەی مارکسیزمدا دەبینییەوە و وڵاتە سۆشیالیزمەکانی بە پشت و پەنای گەلان دادەنا و دژی لادەران و هەلپەرستانی نێو بزووتنەوە مارکسییێتییەکەش بوو، هەروەها دوژمنی سەرسەختی ئیمپریالیزم و سیستمی پاشایەتی عێراق و سیستمە شۆڤێنییەکانی دی ناوچەکە بوو .. هەر بەم پێودانگەش شەیدای شۆڕشی چواردەی گەلاوێژ و عەبدولکەریم قاسمی پێشەواکەی بوو .. وێڕای ئەوەی زانستخوازێکی کەم وێنەی ئەو ڕۆژگارە بوو.. داکۆکیکەرێکی گەورەی مافی ئافرەتان و ڕێگەچارەی کێشەی ئازادی و یەکسانی ژنانیش بوو.. بە واتایێکی دی ڕۆشنبیرێکی پێشەوای پڕبەپێستی سەردەمەکەی و قەڵەمێکی داهێنەر و بوێری مۆدێرن بوو.

* * *

پێموایە خراپ نابێ ئەگەر بەکورتی سەرنجتان بۆ جۆری ڕێنووس و دارشتنی زمانەوانی لە بەرهەمەکانی محەرەمدا رابکێشم.. لە هەردوو ڕووەکەوە جیاوازیەکی ئاشکرا لە نووسینەکانی سەرەتا و دواییدا بەدی دەکەین و.. وردە وردە هەست بەوەدەکەین زمان و دارشتن و گوزارەکردنەکانی پوخت و تۆکمەتر و تەنانەت ڕێنووسەکەیشی دروست و لەباترە.

لە سەرەتادا ئەو وشانەی بە (و) دەست پێدەکەن و پیتێکی بزوێن بەدوایانەوە نایەت، تێکرا بە دوو واو (وو) دەینووسین.. هەروەها لەبری (و)ی عەتف. سەرەتای ڕستەی بە (وە) دەست پێکردووە.. کە ئێستا بەتەنیا (و) دەنووسرێ و دەشکەوێتە کۆتایی ڕستەی پێشوویەوە.. وەلێ دواتر هەم وشەکانی بەیەك (و) دەنووسی و.. هەم دەستبەرداری ئەو (وە)یەی سەرەتای ڕستەکان بوو.. واپێدەچێ بەکارهێنانی ئەم (وە)یە لە ژێر کاریگەرێتی (واوی عەتف)ی زمانی عەرەبییەوە دزەی کردبێتە نێو زمانی نووسین و ئاخاوتن و ڕێنووسەکەشمان.. کە تا شەستەکانی سەدەی رابردوویش زۆربەی کەڵە نووسەرانمانی بەخۆیەوە گیرۆدە کردبوو.

بەڵام پاشبەندی (دا) کە بۆ زەرفی شوێن و کات و حاڵەتی دیش بەکاردەهێنرێت.. وەکو (لەم ژوورە ـ دا)، یا (لەو ڕۆژە ـ دا).. ئەوا بەهۆی زاڵبوونی ئاخاوتنی ناوچەیی سلێمانییەوە، کە نە هەر (د)ی (دا)ی پاشبەندەکان دەخۆن.. بەڵکو زۆربەی هەرەزۆری (د)ەکان، یان دەخۆن، یان دەیانگۆڕن بە (ی).. وەك (لەم شوێنەیا) و (لەو کاتەیا) و.. تاد. لە سەرەتای وشەشەوە.. هەموو (دە)کان لەسەر شێوازی سلێمانی بە (ئە) دەنووسرێ و دەخوێندرێتەوە.. وەکو (دەچێ) دەبێ بە (ئەچێ).. ئەم دیاردەیەیان بەردەوامە و هەتا بەدوا نووسینەکانیشییەوە هەر ماوەتەوە و.. گەلێ لە نووسەرانمان تا ئێستەیش کەم تا زۆر پەیڕەوی دەکەن و.. هێشتا گۆبەنگی ئەم (د)ە یەکلایی نەبۆتەوە و مایەی مشتومڕە.

ئێمەیش لێرەدا بەپێی توانا هەوڵمانداوە هەردوولا، هەم خوێنەر و هەم باسکاری زمانەوانی و ڕێنووسمان ڕەچاو بکەین.. واتا ئەوانەی مایەی مشتومڕ نین هێناومانەتە سەر ڕێنووسی ئەمڕۆ و ئەوانی دیمان وەك خۆیان هێشتوونەتەوە .. بەتایبەتی نووسینی دوو (وو)ی پێش ئەو وشانەی بە (و) دەستپێدەکەن و پیتی بزوێنیان بەدوادا دێت.. هەموویانمان کردە یەك (و).. ئەوانی دیمان بە هەردوو جۆرەکە وەك خۆیان هێشتنەوە.. لەلایەکی دیشەوە خوێنەر دوو بابەتی کورتی دووجار بڵاوکراوە دەبینێت.. کە بەر لە چاپدانیان لە دووتوێی کتێبدا ، نووسەر لە ڕۆژنامەدا بڵاویکردوونەتەوە.. ئەمەیش

هەروەك نموونەی ئەم دوو حاڵەتە .. کە بێگومـان خوێنـەر و باسـکاریش هەسـت بـە جیاوازی نێوانیان دەکەن .. وێڕای هەموو ئەمانەیش باسکاری ڕێنووسـی کـوردی بـەم شێوە پیتانە (پیتی عەرەبی هەموارکراو) ناتوانێ بەتەواوی پـشت بـە ڕێنووسـی ئـەم کۆبەرهەمە ببەستێ بۆ ڕوونکردنەوەی جیاوازیەکان و ساغکردنەوەی ڕێنووسی کـۆن و نوێ .. بەڵکو ناچارە بگەڕێتەوە سەر دەقە بڵاوکراوەکانی پێشوو.

* * *

دەزانم نەبۆتە باو لـە کۆبەرهـەمی نووسـەرێکدا جگـە لـەو بەرهەمانـەی خـۆی، نووسینی کەسانی دی تێ بناخنرێت.. گەرچی ئەم نووسینانە بیر و بۆچوون و ڕەخنـە و هەڵسەنگاندنیش بن.. یاخود بەدەگمەن و تاکوتەرا ئەو جۆرە نووسینانەی تێدەکەوێ.. بەڵام ئێمە لێرەدا مەبەسـتمان بـوو چـەند بابـەت و نووسـین و ڕەخنـە و تۆژینـەوە و ڕەتدانەوەیەك لەبارەی بەرهەمەکانی محەرەم ـ هێندەی بە پێویـستمان زانیبـێ و بۆمـان مەیسەر بووبێ و دەستمان کەوتبێ ـ وەك نموونەی بۆچوون و هەڵسەنگاندنی جیاواز بۆ ئەفراندنـەکانی و تەنانـەت کەموکووریەکانیـشی.. بیانخەینـە بـەر دەسـت و دیـدی خوێنەران.. تاکو خوێنەر بتوانێ بەئاسانی و لە هەموو لایەنەکانییەوە بەئاگابێت.

* * *

ئازیزان: زۆرباش دەزانم لە قالو بەلاوە دنیا هـەروا بـووە.. کەسـانێکی شایـستە و داهێنەر بۆ ماوەیـەکی زۆر فـەرامۆش دەکـرێن و.. کەسـانێکی دی بـە پێـچەوانەوە، بەهۆی ڕەخسانی بارودۆخێکی نەفرەتییەوە، سەدان هێندەی خۆیانیان بۆ دەکرێ.. وەلێ نە ئەوان بۆ هەتا هەتایە هەر بە فەرامۆشکراوی دەمێننەوە.. نە ئـەمانیش بـۆ هـەتا هەتایە لـەو بارودۆخـەدا دەبـن و.. بـە بەسەرچـوونی ئـەو دەور و دووکانـە وردەوردە ئەخرێنەوە نێو قارغە شایـستەکەی خۆیان..

محەرەم محەمەد ئەمین یەکێکە لەو کەسایەتییانەی یەکەمیـان.. چ لە ژیانـدا و ، چ دوای کۆچـی دوایـیکردنـی، ئـەوە بـۆ بیـست و سـێ سـاڵ دەچـێ، دوای چـلەی ماتەمینیەکەی فەرامۆشکراوە.. تـەنیا جارێـك وەزارەتـی ڕۆشـنبیری لـە هـەولێر

نیمچە کۆڕێکی بۆ گرت ، هەروەها ژمارەیەکی کەم لاپەڕەیی (ڕۆڤار)ی دەزگای (سەردەم)یشی لە سلێمانی بۆ تەرخانکرا.. هەردوولا شایانی سوپاس و دەستخۆشانە لیّ کردنن.

منیش لێرەدا بۆیێ لە هەڵسووڕاندنی ئەم کارەدا.. عاشقانە و لێبڕاوانە چاکم لێکرد بەلادا و.. سەرەوکاریکردنم بۆ راپەراندنی ئەم کۆبەرهەمە، بە پلەی یەکەم بەو مەبەستە بوو تەمی فەرامۆشکردنەکەی لەسەر بڕەوێنمەوە.. خۆزگە دێرینەکەی ئەو مامۆستا و هاوڕێ چیرۆکنووس و رۆژنامەنووس و وەرگێڕ و تێکۆشەر و کوردپەروەر و پێشکەوتنخوازە بێنمەدی و هیچی تر.

خۆشەویستان!

ئەمانەی لەم پێشەکییەدا خستوومنەتەڕوو.. هەڵسەنگاندن، یان تۆژینەوەی زانستیانەی بەرهەمەکانی محەرەم محەمەد ئەمین نین.. بەڵکو تەنیا چەند سەرە قەڵەم و چەند تێبینییەکی کورت و تیژ تێپەڕن.. تا خوێنەر وێنایەکی گشتی لێوەرگرێت.. واتا ئیشی باسکاران و توێژەران لێرەوە دەست پێدەکات و.. هیوادارم بە ئامادەکردن و خستنە بەردەستی ئەم کۆبەرهەمەی محەرەم محەمەد ئەمین کارئاسانییەکم بۆ قەڵەم و بیر و ڕەخنەی زانستیانەی ئەو توێژەرە و باسکارانەی کورد کردبێ.

*　　*　　*

بەکورتی لە دووتوێی ئەم کۆبەرهەمەدا خوێنەر ڕووبەڕووی چەندین بابەتی جۆراوجۆر لە بوارە جیاوازەکاندا دەبێتەوە.. لە پێش هەموویشیانەوە ئەدەب (چیرۆک)، ئەمجا مێژوو، فەلسەفە، زانست، کۆمەڵایەتی، دەروونی، ڕۆژنامەوانی...تاد، ئەو بابەتانەی دەڵێی بە دانسقە هەڵبژێردراون، ئەوانەی تۆز و گەردی دەیان ساڵیان نەگرتووە و هەمیشە تەڕ و تازەن و دەڵێی بۆ ئەمڕۆ و ئەم ئەوەیە نوسراون، وێڕای ئەو تام و چێژەیان کە بێگومانم خوێنەر لێیان بێزار نابێ .. چونکە تێکڕا بە زمانێکی سادە و ئاسان نوسراون.. بەتایبەتی زمانی چیرۆکەکانی هێگجار ڕەوان و سەرنجڕاکێشە.. کە ئەم زمانە ڕەوانە لە هەندێ لە وەرگێڕانەکاندا لەو ئاستەدا نییە...

کەم تا زۆر هەست بە کێماسیەکانی زمانی وەرگێڕان دەکرێت.. لە هەمان کاتدا بە ئاشکرا هەست بە بەهێزی و بە سەلیقەیی نووسەریش لە هەڵبژاردنی بابەتە وەرگێڕاوەکاندا دەکرێت ..ئێمە لە کاتی ڕاپەڕاندنی ئەم کارەدا بە مەبەستەوە تووخنی هیچ وشەیەکی نەکەوتین و نەمانکرد هەڵە زمانەوانی ڕێزمانییەکان ڕاستبکەینەوە.. تاکو وێنەیەکی ڕاستینەی وەرگێڕانی ئەو ڕۆژگارە وەك خۆی لەبەر دەستی باسکار و توێژەراندا بێت.

* * *

دوا وتەم.. لە کانگەی دڵمەوە سوپاسی بێپایانی گشت ئەو هاوڕێ و دۆستە ئازیزانەم دەکەم لەم کارەدا ڕێنماییان کردم و بۆ دۆزینەوە و بەدەستخستنی سەرچاوەکان بەدەنگمەوە هاتن.. بەتایبەتی هاوڕێی دێرین و بەڕێزم مامۆستا عومەر مارف بەرزنجی.. هەروەها مامۆستا و هاوڕێی خۆشەویستم د. مارف خەزنەدار و مامۆستا مستەفا سالّح کەریم و مامۆستا جیهان عومەر و مامۆستا مەحموود زامدار و کاکە شەهاب ئەحمەد.. هەروەها زۆر سوپاسی خوشك و برا کارمەندەکانی بەشی گۆڤار و ڕۆژنامە کوردیەکانی کتێبخانەی گشتی سلێمانی و کتێبخانەی ئەوقافی سلێمانی دەکەم.. بەهاریکاریکردنە دڵسۆزانەکەیان منەتباریان کردم.. بێگومانم گشت ڕێنمایی و هاریکاریکردنەکانی تێکڕای ئەو مامۆستا و کارمەند و مرۆڤە ڕێزدارانە لە خۆشەویستی وەفاداریانەوە بۆ ژیان و قەڵەم و مەرگی محەڕەم محەمەد ئەمین هەڵقوڵابوو.

١٤ ی تەمووزی ٢٠٠٨

==================================================

# محەرِەم محەمەد ئەمین (١٩٢١–١٩٨٠)

د. مارف خەزنەدار

## ژیانی

محەرِەم محەمەد ئەمین یەکێکە لە نووسەرە دیارەکانی نەوەی تازە کە لە سەرەتای پەنجاکانی سەدەی بیستەمدا هاتنە ناو مەیدانی ئەدەبی کوردیەوە.. نووسەر لە ساڵی ١٩٢١ لە شاری سلێمانی لەدایکبووە.. هەر لەوێ قوتابخانەی سەرەتایی و ئامادەیی تەواو کردووە.. لە ساڵی ١٩٤٨ لە کۆلێژی ماف (حقوق)ی بەغدا وەرگیراوە.. بەڵام زوو لەبەر هەندێ هۆی سیاسی نەیتوانیوە لەسەر خوێندن بەردەوام بێ.. ئیتر بووە بە مووچەخۆری میری و گوزەرانی لەسەر ئەوەبوو.. لە ژیانی موچەخۆریدا لە کارگێری ئازووقە (تەموین) و پەروەردە و نامەخانەی گشتی سلێمانی و قەلاچۆکردنی مەلاریا و شارەوانی و هی دیکە کاری کردووە.

نووسەر دەوری لە رۆژنامەگەری ئەدەبیی کوردیدا بوو.. لە ساڵانی ١٩٦٠ – ١٩٦١ بەشداری لە دەستەی نووسەرانی کۆواری ئەدەبیی مانگانەیی "رۆژی نوێ" کردووە.. هەندێ بەرهەمی تێدا بڵاوکردۆتەوە.. هەروەها لەزۆربەی رۆژنامە و کۆرِە کوردەوارییەکانی ئەو سەردەمەدا بەرهەمی بڵاوکردۆتەوە و.. نووسینەکانی بۆنی ئازادی و سەربەستیان لێدێ.

محەرِەم محەمەد ئەمین کەسێکی کرِ و بێ دەنگ بوو.. بەڵام لەناوەوەی خۆی هۆشیار بوو.. گیانی نەتەوەپەرستی و ئازادیی بیروڕا لەلای بەهێز بوو.. کاری موچەخۆری تەنیا بۆ بەسەربردنی گوزەرانی ماڵەوەی بوو لە رووی داراییەوە.. دڵسۆزی کاری

ئەدەبی خۆی بوو و کاتی بۆ تەرخان کردبوو.. نووسەر لە ٢٣ی ئاغستۆسی ساڵی ١٩٨٠ لە سلێمانی مەڵبەندی لەدایکبوون و ژیانی کۆچی دوای کردووە.

**بەرهەمی**

نووسەر لە تافی لاویدا هەردوو تای لەنگەری تەرازووی ژیانی یەکسان بوو.. تایەکی کۆری تێکۆشان و جووڵانەوەی سیاسی بووە.. لەم رێیەدا سزای چەشتووە و خراوەتە بەندیخانەوە.. تایەکەی دیکەی قەڵەم و داهێنانی ئەدەبی و نووسینی بەکەڵك بووە.. هەر لەسەردەمی قوتابیەتیدا مەیلێکی تەواوی بووە لە خوێندنەوەی چیرۆك و رۆمان.. ئەمە رێگەی بۆ نووسەر خۆش کردووە روو بکاتە چیرۆك نووسین.

قارەمانی چیرۆکەکانی محەرەم محەمەد ئەمین نوێنەری هەژار و بێ دەرامەت و بێ دەسەڵاتی ناو کۆمەڵن.. لەمانە چیرۆکی "مام هۆمەر".. کە ئەمە ناوی کۆڵهەڵگرێکی هەژارە هەندێ تەنگ و چەڵەمەی کۆمەڵایەتی بە شێوازێکی ساکار دەخاتەروو.. ئەم چیرۆکە رەنگە بۆ کۆمەڵێکی پێشکەوتوو لە پلەی هونەرێکی بەرزدا نەبێ.. بەڵام بۆ کۆمەڵی کوردەواری کە تازە بابەتی چیرۆك لە ئەدەبیدا پەیدا بووبوو دەوری هەیە.. کۆڵهەڵگرێکی هەژار ئەگەر رۆژێك کار نەکا نان نابێ بیخوا.. لەبەر ئەوە مام هۆمەر ناچاربوو دزی بکا.. جارێکیان لێی ئاشکرا دەبێ.. سێ مانگ دەخرێتە بەندیخانەوە.. لەو ماوەیەدا خێزانی بەناچاری لەشی خۆی دەفرۆشێ بۆ ئەوەی نانی منداڵەکانی دابین بکا.

لەدوای بڵاوبوونەوەی ئەم چیرۆکە نووسەر پێشکەوتنێکی دیاری بەخۆیەوە دی لە نووسینی چیرۆکدا.. لە ساڵی ١٩٥٧ دا نووسەر دوو چیرۆکی "سەیرانێك لە ئەزمڕ" و "زیندووی مردوو"ی لە کتێبێکدا بڵاوکردەوە بەناوی "گۆمی شڵەقاو" .. چیرۆکی "سەیرانێك لە ئەزمڕ" نموونەی وەستایەتی نووسەرەکەیەتی.. قارەمانەکان لاوی بێکاری ناو شارن.. کاری تایبەتیان نییە.. هەرچی کارێکی هەبێ دەیکەن.. لەگەڵ دەستکورتی و هەژاریدا لە گیانی گاڵتە و گەپ و قۆشمەیی دوور نین.. هەندێ جار وا دەکەونە بەرچاو بەتەنگ ژیانەوە نەبن.. بیر لە ئەمڕۆ دەکەنەوە و لایان وایە بۆ سبەینێ خودا کەریمە.

محەرەم محەمەد ئـەمین لـە چـیرۆکەکانیدا هەوڵـدەدا ڕووی ڕاسـتەقینەی ڕەنجبـەر و کرێکاران بخاتەڕوو.. بەوەی هەمیشە لە ژیـانی بێکـاری و نـەبوونی ئـیش دەترسـن.. بەگشتی چیرۆکەکانی ڕەخنە لە ناهەمواری کۆمەڵایەتی و نەبوونی یەکسانی دەگرن.

توانای نووسەر لـەدوای کودەتـای سـوپایەکەی ١٤ی تـەمموزی ١٩٥٨ی بەغـدا زیـاتر کەوتەڕوو.. هەرچەندە زمان و شێواز و پێویستییەکانی چیرۆك لەلای نووسەر بەهێز بـوون.. بەڵام ناوەرۆکی چیرۆکەکانی دەتوانرێ هـی چیرۆکنووسـەکانی دیکـەی ئـەو ڕۆژگـارەش بـە دیاردەیەکی سیاسی ڕۆژانە دابنرێ.. ناوەرۆکی بەرهەمی ئەو سەردەمە بوو لە پڕوپاگەندە بۆ کودەتاکە.. لەلای محەرەم محەمەد ئەمین بەجوانی و ڕێکی ڕەنگیـان لـە چـیرۆکی "ڕێگـەی ئازادی" (١٩٥٩) داوەتەوە.. لێرەدا نووسـەر دەسـەڵاتی کۆمـەڵی دەوری مـەلیکی پـێش ١٩٥٨ تاوانبار دەکا بەوەی بۆتە هۆی دواکەوتوویی کۆمەڵ.. بەوەی خەڵکی دەڕووتانـدەوە بۆ چاکەی کاربەدەستە دەوڵەمەندەکان و وڵاتی بێگانـەی دەرەوە.. هـەروەها نووسـەر ئـەو هۆیانە دەخاتەڕوو کە بوون بە پاڵپشت بۆ سەرکەوتنی کودەتا سوپاییەکە.

لە قۆناغی ژیانی ئەدەبیدا محەرەم محەمەد ئەمین دوو ڕێچکەی گرتبوو.. یەکـەمیان بەردەوام بوو لەسەر چیرۆك نووسـین و.. لـەو ماوەیـەدا چـیرۆکی "گـردی شـەهیدان" (١٩٥٨) و.. کۆمەڵـە چـیرۆکی "ئـادەمیزاد" (١٩٦٩)ی بڵاوکـردەوە.. دووەمیـان خزمەتێکی گەورەی ڕۆشنبیری کوردی دەکرد لە ڕێگەی وەرگێڕان لە زمانانی بێگانەوە بۆ زمانی کوردی.. لەمەشدا نووسەر بابەتی هەمەجۆری هەڵدەبژارد.. لەمانە چیرۆکی "یادی گۆرستانەکە"ی نووسەر ڕووس دستۆیفـسـکی.. هـەروەها بابـەتی مێـژوویی و فەلـسەفی و ماف و کۆمەڵایەتی.. بەمە بەراسـتی بەشدارییەکی بـەهێزی دەکـرد لـە دەوڵەمەندکردنی نامەخانـەی کـوردی.. بەتایبـەتی لـەو ڕۆژگـارەدا وەرگێـڕان دەوری گرنگی هەبوو.. چونکە هەموو توانایەکی ئەدەبی و هونەری لەوکاتەدا تەرخان کرابـوو بۆ پڕوپاگەندە لەپێناوی پاراسـتنی دەسکەوتەکانی کودەتا سـوپاییەکە.. بۆیە وەرگێڕانی ئەو بابەتانەی ڕاستەوخۆ پێوەندیان بەکودەتا و شۆڕشەوە نەبوو.. نرخێکـی تایبـەتیان هەبوو لە ڕۆشنبیری کوردیدا.

زانینی زمانی کوردی و خۆ پەروەردەکردن لە خوێندەواری کوردیدا لەلای محەرەم محەمەد ئەمین وەکو زۆربەی نووسەر و شاعیر و رۆشنبیرانی دیکەی لەخۆیانەوە بووە.. واتە خۆیان خۆیان فێر کردووە.. خوێندنی رێك و پێکی قوتابخانەیی لەو رۆژگارەدا بەزمانی کوردی نەبووە.. لە هیچ لایەکی کوردستاندا دام و دەزگای زانیاری و زانستی نەبووە بۆ فێربوون و لێکۆڵینەوە لە سامانی نەتەوەیی کورد.. ئەوە هەبووە لە هەندێ ولاتانی ئەوروپا لە دەسگا زانستییەکاندا لە مەیدانی رۆژهەلاتناسیدا کەلتوور و خوێندەواری کوردی پارێزرابوو.

زمانی نووسینی محەرەم محەمەد ئەمین بەتایبەتی چیرۆکەکانی ئاسان و بێ گرێ و مانا لەرووە.. لاکۆنیزم واتە کورتی و وردی لە دەربڕینی بیر لە نووسینیدا دیارە.. نووسەر بەتوانا بوو لە دۆزینەوەی شتی تازە.. رێگەی تازە.. بەم پێیە لە دوارۆژدا گۆڕانی تێدا دیار بوو.. لەگەڵ ئەوەشدا نووسینی بەقەوارە لەگەڵ تەمەنیدا رێك ناکەون.. واتە کەمترن. ئەوەش وەنەبێ تایبەتی بێ بە محەرەم محەمەد ئەمین.. بەڵکو ئەمە سیفەتی زۆربەی داهێنەرانی کوردە لە شاعیر و نووسەران.. هۆی ئەمە بێگومان رەنگدانەوەی سەختی ژیان و نارێکی باری سیاسی کۆمەڵە.. هەندێ جاریش زانست و زانیاری و هونەر و ئەدەب دەکەونە مەترسییەوە لە هەموو پارچەکانی کوردستاندا.. وەکو ئەم دیاردەیە لە ناوەراستی شەستەکانی سەدەی بیستەم (١٩٦٣ ـ ١٩٦٧) لە کوردستانی عێراق کەوتە ناوەوە.

سەرجەمی بەرهەمەکانی محەرەم محەمەد ئەمین پێویستیان بە کۆکردنەوە هەیە.. پێویستە ئەوەش بزانرێ بەرهەمی وای هەیە تا ئێستا بلاونەکراوەتەوە.

==================================================

* د. مارف خەزنەدار ـ مێژووی ئەدەبی کوردی
بەرگی حەوتەم (بەشی سی و یەکەم) هەولێر: ٢٠٠٦ ل ٤١٧ ـ ٤٢٠.

# وشە ئاوارەکانت بۆ ناو فەرهەنگی شۆڕشگێڕان دەگەڕێنەوە

مستەفا سالّح کەریم

لە کوێوە دەست پێ بکەم، لە سەرەتاوە یان لە کۆتاییەوە، ئەگەرچی لای من کۆتایی کەڵە روناکبیرێکی دڵسۆزی کەم ژیاو لەدایك بوونێکی نوێیە لای ئەو نەوەیەی بەرێز و قەدرزانینەوە دەڕوانە سالانی ژیان و هەورازی رێبازی و بەرهەمی بەسوودی.

سەرەتای محەرەم محەمەد ئەمین لە سالێك و لە شارێکدا دەست پێدەکا کە هەرسێکیان مرۆڤ و سال و شار، سێقۆلی داستانی قارەمانێتی نەتەوەیەك دەگێڕنەوە کە پشتاو پشت دەرسی لێ وەربگیرێ و ببێتە هاندەرێ بۆ خەباتی نەپساوەی درێژخایەن.

سال سالی (١٩٢١) ە، شاری غەزنە بێ مەحموودە وەك داریکەلی، سلێمانی گیرۆدەی دەستی ئینگلیزی داگیرکەرە، حوکمداریش ردوانەی هەندەران کراوە، تۆلەی ئەو تۆزە سەربەستیەی سالی پاری لێ دەسێننەوە.. ناوی رۆڵەکانی لەسەر کێلە بەردەکان هەڵدەکەندرێ و.. لاوەکانی پیش دەخۆنەوە و بیر لە ئاسۆیەکی ئەرخەوانی نوێ دەکەنەوە.. لەم کاتەدا مرۆڤێکی تری کورد چاوی بەم دیمەنانە هەڵهێنا، بە تەقەی تفەنگ و دەنگی فرۆکە و مەترەلیۆز گوێی کرایەوە، کاتێ بوو شارەکەی بیرەوەریەکانی دەهێنایەوە یاد و.. روناکبیرانی دەیانویست نەخشەیەکی تازە بۆ ولات بنەخشێنن، لەم کاتەدا محەرەم محەمەد ئەمینیش بە شیری کوردایەتی گۆشکرا.

* * *

سەرەتای بیرەوەرییەکانی منیش لەگەڵیا دەگەڕێتەوە بۆ سالێك بۆنی باروت و قورقوشم، عێراقی سەرانسەر هەراسان کردبوو، شەهیدانی سەر پردی بەغدا

تەرمەکانیان بەرێزەوە بەرەو شارەکان دەبرانەوە، شاری ئێمەش وەك هەموو جارێکی تری لەو شانازیە بێبەش نەبوو، تەرمی شەهیدێکی بۆ هاتەوە کە هەموو حەوت مانگێك لەوەبەر تەرمی دوو ئەفسەریشی گرتبووە باوەش. لەم کاتانەدا دەستەیە قوتابی تازە پێگەیشتوبووین، حەزمان لە خوێندنەوە دەکرد، بۆ ئەو حەزەش پەنامان دەبردەبەر کتێبخانەی گشتی. ئەو فەرمانبەرەی کتێبی دەداینێ.. رێی پیشان دەداین و.. هەندێ جاریش وشە گرانەکانی بۆ لێك دەداینەوە و دەیویست فێرمان بکات بەهۆی وشەوە قفڵی تەلیسمەکانی ئەم جیهانە جەنجاڵە بکەینەوە، ئەو فەرمانبەرە رابەرە مامۆستا محەرەم بوو. پاش چەند مانگێك شالآوی ئیرهابی عورفی دەستی نایە بینە قاقای هەموو سەربەستیەك، وشە پیرۆزەکانی تاساند، زیندانەکان وەك نەهەنگ، تیکۆشەرانیان قووت ئەدا، کە پشویەکمان دا و سەرمان لە کتێبخانەدا، فەرمانبەری دۆستمان بۆ دەلتاوا گوێزرابووەوە، ئەگەرچی ئێمە لە تەمەنێکی وادا نەبووین لە خۆمان رابیینین کە ئەو فەرمانبەرە دڵسۆزە هاورێمان بووبێ، بەڵام پڕ بەدڵ بۆی بە پەرۆش بووین، دیارە هاورێیەتیش پەیوەندی بەتەمەنەوە نییە.. زیاتر بە بیر و هۆش و لێك گەیشتن و وەفاداری و دڵسۆزیەوەیە.

پاش چەند مانگێك ئێمەی پۆلە قوتابی، هەندێکمان لێ گیرا و هەندێکیشمان لە قوتابخانە دەرکراین، مامۆستاش لە دەلتاوەوە بەدەرکراوی گەڕایەوە، هەر بەو بۆنەیەشەوە نەیتوانی لە کۆلێژی حقوق دەوام بکات کە سەرەتای ئەوساڵە تێیدا وەرگیرابوو، هاتەوە شارەکەی و تێکەڵ بە لێقەوماوان و دەرکراوان و رووناکبیرە بەتاڵەکان بوو.

لە ساڵی ١٩٥٢ بوو بەکارگوزار لە دایەرەی قەڵاچۆکردنی لەرزوتا، بەڵام لەرزوتای ترسناکتر کە بیری لە قەڵاچۆکردنی دەکردەوە، ئەو داگیرکەرانە بوون کە هەرچی مافی مرۆڤایەتییە بە میللەتەکەیان رەوانەدەبینی، لەپاڵ خەباتی سیاسیدا خووی دایە خوێندنەوە، دوای راپەرینی تشرینی ٥٢ دەستی دایەوە قەڵەمەکەی، ویستی ئەو بیرۆکانەی لە مێشکیدا پەنگ دەخۆنەوە دەریان بڕێ، ئەوەبوو تەقینەوەی سەرەتای

بەرهەمی چیرۆکنووسینی کەوتە دوای راپەرینی جوتیارانی دەشتی دزەیی و کوشتارەکەی بەندیخانەی مەرکەزی لە بەغدا. رۆژی ١٩٥٣/١١/١٩ چیرۆکی (زیندووی مردوو)ی لە رۆژنامەی ژیندا بلاوکردەوە*، لەم چیرۆکەدا (محەرەم ویستی تەعبیر لە نارەزایی مرۆڤی کورد بکا بەرامبەر بەو ژیانە، چیرۆکەکە تابلۆیەکی هەوڵ و تێکۆشانە لە شێوەیەکی رەمزیدا بۆ هیوایەکی دیاریکراو.. بۆ بەگژاچوونی نوێنەرانی زوڵم و ستەم و هاندانی جەماوەرە بۆ تەقینەوە بەرووی چەوسێنەرانا)†.

لەبارەی ئەم سەرەتایەی مامۆستا محەرەم، لە ئەتروحەکەیدا دکتۆر عەزەدین مستەفا دەڵێ: (محەرەم بەخەیاڵێکی فراوان و دوور لە ژیان تەعبیر لە مەسەلەی تێکۆشان دەکات لەپێناوی مرۆڤ و بەختیاریدا، ئەمە تاکە چیرۆکیەتی کە نووسەر بەشێواز و مادەی وێنەگرتنی لە ژیان دوور دەکەوێتەوە و.. نارەزایی بەرامبەر بەگوێنەدان بە مرۆڤ دەردەبڕی، لەهەمان کاتدا مادەی چیرۆکەکانی تری لە واقیعی ژیان وەردەگرێ و.. چارەسەری مەسەلەی ژیانی رۆژانە و مرۆڤایەتی دەکات)‡.

لە ساڵی ١٩٥٤ دا، لەکاتێکدا دیوارە نەخشاوەکانی شار ئەوەی دەگەیاند، میللەت دەیەوێ نوێنەری راستەقینەی خۆی بگەیەنێتە ئەنجومەنی نەواب، هێزە نیشتیمانییەکان پاڵیان دابووە پاڵ یەك، رووناکبیران بەتەمای ئەوە بوون کە هەوڵ و تەقەلاکەیان بگاتە ئەنجام، بەلام ساختە و کەڵەکبازی و چاو و راو نامانجی گەلی پێشێل کرد و هەموو شت بەپێچەوانە سووڕایەوە. لەم کاتەدا محەرەم کە دەیزانی دزە گەورەکان بەداوەوە نابن، بەلام دزی بچووك پێستی بۆ دەباخخانە دەبرێ، لە دایەرەی لەرزوتاش ئەوە فێرببوو کە لە قەلاچۆکردنیشدا هەمیشە مێشولە وردەکان زوو پێوەدەبن و ئەنۆفلە خوێنمژەکانیش وەك بەرزەکی بانان بۆی دەردەچن. ئا

* لێکۆڵینەوە و بیبلۆگرافیای چیرۆکی کوردی – عومەر مارف بەرزنجی ، ل. ١١٣

† الواقعية في الأدب الكردي – د. عزالدين رسول، ص. ١٠٥

‡ الواقعية في الأدب الكردي – د. عزالدين رسول، ص. ١٠٥

لەم کاتەدا چیرۆکی (مام هۆمەر)ی بڵاوکردەوە.. (نووسەر مەسەلەی دزیکردنی کردووە بە گەوهەری چیرۆکەکە)* ، ئەم ڕایە ڕاستە چونکە مام هۆمەر لە کۆمەڵگایەکدا دەژی، چەوساندنەوەی مرۆڤ لەلایەن مرۆڤەوە بووە بە نەریت، دزی و پیاوخراپی و دەستبڕین باڵی بەسەر دایەرە و فەرمانگەکانا ڕاکێشابوو، بێ ئیشی و برسێتیش لەولاوە. مام هۆمەری بێدەرەتان پەنا ئەباتە بەر دزی لەپێناوی نانا، بەڵام مام هۆمەر خۆ لە چینە بەرەوژوورەکان نییە.. بابخرێتە زیندانەوە، قیروسیاش لە ژنە گەنجەکەی و منداڵەکانی!

لە ساڵی ١٩٥٧ دا کە لە ڕۆژنامەی ژینا نووسەر بووم، بۆ جاری دووەم محەڕەم محەمەد ئەمینم بەباشی ناسی، بووە هاوڕێیەکی زۆر ئازیزم، بۆیە دەرکەوت چ مرۆڤێکی ڕاستگۆ و دڵسۆز و بەوەفایە، چەند بە پەرۆشە بۆ وشەی کوردی، چەند بێدەنگ و هێمن و لەسەرخۆیە، حەزی ئەکرد هەموو تازە خونچەکانی باخچەی ئەدەبی کوردی بگەشێنەوە، هەرگیز بەبیریا نەئەهات دەست بۆ پچڕاندنی یەکێ لەو خونچانە ببا، ڕق و کینەی نەدەزانی، بەخراپە هەرگیز باسی هیچ هاوڕێیەکی نەدەکرد.

لەم سەردەمەدا (گۆمی شڵەقاو)ی بڵاوکردەوە، بریتی بوو لە دوو چیرۆك، (زیندووی مردوو) کە لەوەو پێش باسمان کرد، لەگەڵ (سەیرانێك لە ئەزمڕ)، ئەمەیان لەراستیدا یەکێکە لەپاڵ (چای شیرین)ی حوسێن عارفدا لە چیرۆکە هەرە جوانەکانی ساڵانی پەنجاکان.. سێ لاوی بێ ئیش هەریەکەیان کارێکی یەکجار سەیر بۆ خۆی دەدۆزێتەوە.. نووسەر (کەسانی چیرۆکەکە) لە جوغزێکی تەسکدا نابەستێتەوە، وازیان لێ دەهێنێ لە بزوتنەوەیەکی بەردەوامدابن و بتوانن ڕەنگی گیروگرفتەکانیان بڕێژن و کرۆکی ناگزوریەکانی ژیان بهێننە سەر دەسگای شیکردنەوە و بەرچاوخستن، بەشدارانیش تێکڕا مرۆڤی ساکاری کۆمەڵی کوردەوارین.

---

* ملتقى القصة الأول – الواقعية الانتقادية كأتجاه رئيس في القصة الكردية – حسين عارف، ص. ١٩٢

لەراستیدا محەرەم زۆر کارامانە و بەشێوەیەکی گاڵتەجاری جیاوازی چینایەتی و چەوساندنەوە دەخاتەروو، (بەلاَم سەیر لەوەدایە ئەو سێ لاوە لەپاڵ کلۆڵی و نەبوونیشیاندا هەمیشە دەم بە پێکەنین و قسەخۆش بوون، هەربۆیەشە لای خوێنەریش خۆشەویستن ئەگەرچی کردەوەی ناپەسەندیش دەکەن، جا نهێنی سەرکەوتنی چیرۆکنووس لەم چیرۆکەیدا لەمەوە دەردەکەوێ)* .

دکتۆر عەزەدینیش لەم رایەدا لەگەڵ حوسێن عارفدا یەك دەگرنەوە کە دەڵێ: (نووسەر لە دەرخستنی سروشت و خاوێنی دەروونی زەحمەت کێشانا زۆر سەرکەوتووە، لەکاتێکدا کەسانی چیرۆکەکەی کاری سەیر و ناشایستە لە کۆمەڵگادا، دەکەن، کەچی دەبینین سادە و دڵسۆز و دڵفراوان و چاکن)† .

ئەوەی شیاوی باسە دکتۆر مارف خەزنەدار لە پێشەکی (گۆمی شلەقاو) دا لەبارەی ئەم دوو چیرۆکە پێشبینییەکی باش دەکات و دەڵێ:

(محەرەم دەبێتە ئەستێرەیەکی گەشی جیهانی چیرۆکی کوردی و چاوەڕوانی گەلێ بەرهەمی نایابی لێ دەکرێ)‡ .

لە ساڵی ١٩٥٨ دا لەگەڵ مامۆستا ئەحمەد زرنگا کە سەرنووسەری (ژین) بوو.. ویستمان چەند گۆشەیەکی نوێ لە رۆژنامەکەدا بکەینەوە، محەرەم یەکێك بوو لەو نووسەرانەی پەیوەندیم پێوەکردن، لەئەنجامدا گۆشەیەکی بەناوی (رێگای راست)ەوە دەستنیشان کرد و زنجیرەیە وتاری تیا بلاَوکردەوە.

لەدوای شۆڕشی چواردەی تەموزی ١٩٥٨.. محەرەم چالاکی سیاسی و ئەدەبی و رۆژنامەنووسی زیاتر پەرەیسەند، لە گەلێك مەیانا سوارچاکانە ئەسپی خۆی تاودا، لە بەرهەمدا چیرۆکی (گردی شەهیدان) و دوای ئەویش (رێگای ئازادی) بلاَوکردەوە،

---

* لێکۆڵینەوە و بیبلۆگرافیای چیرۆکی کوردی – عومەر مارف بەرزنجی ، ل. ١١٢

† ملتقى القصة الأول – الواقعية الانتقادية كأتجاه رئيس في القصة الكردية – حسين عارف، ص. ١٩٤

‡ گۆمی شلەقاو – پێشەکی د. مارف خەزنەدار.

بوو بە ئەندامی دەستەی بەڕێوەبەری کۆمەڵی هونەرە جوانەکان کە مامۆستا (گۆران) سەرۆکی بوو.

بوو بە سکرتێری نووسینی گۆڤاری (شەفەق) کە بۆ دواجار خوالێخۆشبوو شێخ قادری بەرزنجەیی لە کەرکووکەوە گواستیەوە سلێمانی.

بوو بە ئەندامی دەستەی نووسینی گۆڤاری (رۆژی نوێ) کە مامۆستا جەمال شاڵی سەرنووسەری بوو، لەم گۆڤارەدا چیرۆکی (شای قەرەجەکان)ی بڵاوکردەوە.. لە رووی ناوەرۆکەوە چیرۆکێکی سەرکەوتووبوو، نووسەر باسی ئەوانە دەکات کە نیشتمان و نەتەوەیان نییە، شای قەرەجەکان وتی:

(توخوا، تۆ بڵێی دەرمانێك هەبێ چاری ئەو دەردە بەناسۆرەی من بکا، لەبەرچی خوا ئێمەی لە سروشتی مرۆڤایەتی بێبەری کردەوە، من مرۆڤایەتی خۆمم لێ ونبووە، منیش لە دڵی خۆما وتم: ئەیەوێ نیشتمان و نەتەوەی هەبێ وەکو هەموو خەڵکێکی تر، بەڵام چۆن یارمەتی بدەم و لەو بێ هیواییە رزگاری بکەم تا.. تاد، کاتێك گەیشتمە بەردەرگا ئەو لە پێچی کۆڵانەکەدا ونبووبوو، ئەو شەوە تا بەیانی خەو نەچووە چاوم.. هەر دەنگی قەرەجەکە لە گوێما دەنگی ئەدایەوە، ئەنیشتیمانم هەیەو ئەنەتەوە، تازە لە کیسم چوو، تازە لە کیس چووم)* .

لە خۆشەویستی محەرەم و لە بڕوای تەواوم بەراستگۆیی، ساڵی ١٩٦٠ کە کۆمەڵە چیرۆکی (شەهیدانی قەڵای دمدم)م بۆ چاپ ئامادەکرد، محەرەم پێشەکییەکەی بۆ نووسیم.. کە وەفا و یادگارێکی ئەمرە و هەرگیز لە بیرم ناچێتەوە، زیاتر لەبەر ئەوەی لە هەندێ رووی بیروباوەڕا یەکمان ئەدەگرتەوە، بەڵام وشەی کوردی کۆی کردبوینەوە و ئاسۆیەکی فراوانی نوێی خستبووە بەردەمان. محەرەم زۆرجاریش لەسەر لاپەڕەی رۆژنامە و گۆڤارەکانا ئەکەوتە موناقەشەی ئەدەبیاتەوە، یان بەرهەمی هاوڕێکانی هەڵدەسەنگاند، بێ ئەوەی بە وشەیەك یەکێکیان برووشێنێ یان هەستیان ئازاربدات، هەمیشە ناسك و نەرم و نیان بوو.

---

* ئادەمیزاد - محەرەم محەمەد ئەمین.

لە ساڵی ١٩٦٧ کە گۆڤاری (رابەر)م دەرکرد، محەرەم یەکێ بوو لەو نووسەرانەی پشتگیری کردم و هانی دام بەردەوام بین لەسەر شکاندنی بەستەڵەکی سڕکردنی وشەی کوردی، هەروەها بەچیرۆکی (بۆخۆیی) هاوبەشی لە گۆڤارەکەمانا کرد.

لە ساڵی ١٩٦٨ کە مامۆستا جەمال بابان بوو سەرۆکی شارەوانی سلێمانی گۆڤارێکی بەناوی (سلێمانی)یەوە دەرکرد، مامۆستا محەرەم یەکێك بوو لە ئەندامە کارامەکانی دەستەی نووسەرانی ئەو گۆڤارە.

لە ساڵی ١٩٦٩ کۆمەڵە چیرۆکێکی بەناوی (ئادەمیزاد)ەوە بڵاوکردەوە بریتی بوو لە سێ چیرۆك: شای قەرەجەکان، بۆخۆیی، پەتیارە.. ئادەمیزادی بەنرخترین سەرمایە لە جیهانا، ئادەمیزادی چەوساوە و پلیشاوەی ژێر هەرەس، میحوەری هەر سێ چیرۆکەکەی بوو.

لە ساڵی ١٩٧٠ بە ئەندامی یەکەم دەستەی بەڕێوەبەری لقی یەکێتی نووسەرانی کورد لە سلێمانی هەڵبژێردرا، کارامانە هاوبەشی لە چالاکییەکانی یەکێتییەکەدا دەکرد، لە کۆڕە ئەدەبییەکانی ناوشارا و لە کۆڕە تەلەفیزیۆنییەکانیشا.

لە ساڵی ١٩٧٤ دوای ٢٠ ساڵی فەرمانبەری لەشارەوانیدا.. بوو بە سەرۆکی شارەوانی، بەڵام ئەوەندە دڵی بەو وەزیفەیە خۆش نەبوو، لەسەر خواستی خۆی گوێزرایەوە بۆ دەسگای (هاوکاری) و لەوێ ماوەیەك سکرتێری نووسینی گۆڤاری (بەیان) بوو.

لە ساڵی ١٩٧٦دا، وازی لە وەزیفە هێنا و.. خۆی خانەنیشین کرد و گەڕایەوە بۆ شاری سلێمانی.

لە ساڵی ١٩٧٨ دا دوای گەڕانەوەم لە رومادی.. چاوپێکەوتنێکمان بوو، گفتوگۆیەکم لەگەڵدا تۆمارکرد، کاتێ خۆی ئێوارەی ١٩٧٨/٨/١٤ لە بەشی رۆشنبیری ئێزگەی کوردیەوە بڵاوکرایەوە.

لە ئەیلوولی ١٩٧٩ دا چوومە لای و تکام لێکرد لەگەڵمانا بێت بۆ (سەلاحەدین) بۆ بەشداری لە یەکەم دیداری چیرۆکی کوردیدا، ئەگەرچی ماوەیەك

بوو دووربوو لەو جۆرە کۆڕانە، بەڵام دەستی بەڕووومەوە نەناو لەگەڵمانا هات، لە ئێوارە کۆڕی چیرۆك خوێندنەوەشا وەك ڕابەرێکی سالانی پەنجاکان چیرۆکی (شای قەرەجەکان)ی خوێندەوە، ئەو چیرۆکەی ئەوساش و ئەو تام و چێژە تایبەتییەی بوویەتی هەر هەیەتی.

وادیاربوو ئەو دیدارەی زۆر لاخۆش بوو، بۆیە چەندجارێك لەوەودوا بەخۆشییەوە باسی یادگاری سەری ڕەش و سەلاحەدینی دەکرد، ئەو ئێوارەیەی چیرۆکەکەی تیا خوێندەوە.. پێش کۆڕەکە بەخەتی خۆی بەکورتی سەرگوزشتەی ژیانی و بەرهەمەکانی بۆ نووسیمەوە.. کە تا ئێستاش وەك دوا یادگاری پیرۆزی لەلامە.

دوای گەڕانەوەمان بە ماوەیەك چیرۆکێکی خۆی دامێ و بەو تەوازوعەی محەڕەمی پێوە ناسرابوو پێی وتم: بیخوێنەرەوە و.. چ تێبینییەکت هەبوو پێم بڵێ . دوای خوێندنەوەی بەنامەیەکی زۆر ناسکەوە چەند تێبینییەکم بۆ دەست نیشانکرد، کە یەکترمان دی تێبینییەکانی لا پەسەند بوو، وتی پاش دەستکاریکردن داومە بە ئاسۆی زانکۆیی بۆ بلاوکردنەوە

لە ناوەندی تەمووزی ئەم ساڵدا.. ئێوارەیەك یەکترمان دی.. بە دووروودرێژی باسی ئەو پرۆژە ئەدەبیانەی بۆ کردم کە بەدەستیەوەیەتی، هەروەها وتی: کاك عومەر مارف بەرزنجییم ڕاسپاردوە چیرۆکەکانم بۆ کۆبکاتەوە .. بەنیازم بیانخەمە ژێر چاپەوە، هەروەها وتی : خۆزگە بمتوانییایە وتارەکانیشم لە ڕۆژنامە و گۆڤارەکاندا کۆبکەمەوە و چاپیان بکەم. ئەو ڕۆژە زۆر ماینەوە و گەلێ ڕاز و خوازمان باس کرد.. نەم ئەزانی ئەمە ماڵئاواییە و دوا چاوپێکەوتن ڕۆژی ٢٣ ی تەمووز، پاش شێوان بیرم لەو ڕۆژە ئەکردەوە کە ئەم شۆڕشەی تێدا بەرپا بوو، چ خۆشیەك کەوتە دڵی هەموو مرۆڤە پێشکەوتنخوازەکانەوە، ئەو ڕۆژەی میسر یەکەم گورزی گرانی خۆی هاوێشت و تەختی شاهانەی تێکدا و... ئێستاش کێ کردی و دەیخوا؟ لەم بیرکردنەوە و یادگارانەدا بووم کە زەنگی تەلەفۆنەکە

خەیاڵەکانی پەرت کرد، هاوڕێم مامۆستا عومەر عارف بەدەم هەنسکەوە پێی وتم: هاوڕێمان محەرەم کۆچی دوایی کرد.

چۆن؟ ئەو مرۆڤەی زیاتر لە سی ساڵ قەڵەمەکەی بۆ چەوساوەکانی گەلی کورد تەرخان کردبوو، ئەو نووسەرە بەشەرەفەی شەوقی ژینی لە چرای وشەی ڕەسەنا بەدی دەکرد، چۆن؟ هەروا مرد و کۆتایی هات! ئایا ئیتر نایبینمەوە؟ ئایا ئەو مرۆڤەی هەموو ژیانی زنجیرەیەکی نەپساوی خەبات بوو بەجێی هێشتین و ڕۆیشت؟

ئەو نووسەرەی یەکێ بوو لەو ڕۆشنبیرانەی پەنجەرە داخراوەکانی بۆ خستینە سەرپشت و.. بەناخی مەسەلە گرنگەکانی میللەتا شۆڕدەبووەوە و دەکەوتە تاوتوێکردنی، ئێستا ئیتر لەناومانا نەما؟

ئەو ئەدیبە مەزنەی ڕێگای ڕاستی گرتەبەر و بەری نەدا، قەڵەمەکەی هەمیشە لە خزمەتی میللەتەکەیدا بوو.

لۆمەم مەکەن کە دڵ بەکوڵ بۆ سوارچاکی رابەر و پێشڕەو بگری، بۆ ئەو ڕێبوارە مەردەی ڕووناکی چاوەکانی کرد بەزەیتی مەشخەڵی وشەی نەمر، هەموو نووسەران مات و خەمبارن بۆ پشکۆ کوژاوەکەمان، بۆ ئەستێرە ئاوابووەکەمان.

پەیمان بێ هەردەم دڵسۆزی وشەکانت بین، ڕێگای ڕاست بەرنەدەین، خەبات و بیر و بڕوات هەمیشە مەشخەڵێکی پرشنگدار بێ بۆ قەڵەم بەدەستەکانی ئاوەڵێت و قوتابییت.

هەزار سڵاو لە گیانی پاکت ئەی میوانە ئازیزەکەی گردەکەی سەیوان.. دوا وشەم ئەم چەند بەیتەیە.. لە گۆرانی نەمری دەخوازم کە بۆ مەحموود جەودەتی شەهیدی وتووە.. پێشکێش بە گیانی محەرەم محەمەد ئەمینی دەکەم کە دەڵێ:

ڕێ چۆڵ کەن بۆ مەیتی ڕێبواری مانو و زیز
توخوا! با کەم تەڕ بێ بە فرمێسکی پاییز
با کەم، با، ڕەشەبا لە لەشی سارد و سڕ
نەك بەردی سەرەڕێ بێتە گۆ بێ بەگڕ

ڕێ بەردەن، با بڕوا بۆ سەیوان تابووتی
چاوشۆڕکەن لە عاستی توانج و تانووتی.

==================================================

* مامۆستا مستەفا سالح کەریم ئەم وتارەی لە ڕۆژی ۱۹۸۰/۸/۲۸ لە باخچەی یەکێتی نووسەرانی کورد لە سلێمانی.. لە کۆڕی چلەی دوامالئاوایی مامۆستا (محەڕەم محەمەد ئەمین)دا خوێندەوە و دواتر لە ژمارە (٥)ی خولی دووەمی گۆڤاری (نووسەری کورد)دا.. ساڵی ۱۹۸۰ بڵاوکراوەتەوە.

# محەرەم محەممەد ئەمین و ئەزموونی وتاری رۆژنامەوانی

**د. هیمدادی حوسێن**

ساڵانی پەنجاکان ناوەندی رۆشنبیری کوردی، بەدەگمەن نووسەری وەکو (محەرەم محەمەد ئەمین)ی تێدا هەڵکەوتووە، کە ئەو هەموو بەهرە ئەدەبی و رۆشنبیریی و سیاسی و فەلسەفییەی تێدا کۆ بێتەوە. دەسپێکی ئەو ئەزموونە لەگەڵ پێوەندی کردن بە دنیای رۆژنامەوانییەوە بووە، تاکە هۆکاری بۆ خۆرۆشنبیریی کردن بۆ رووناکبیرانی ئەویَ رۆژێ بە پلەی یەکەم رۆژنامەوانی بووە و ئەدەبی کوردی خاوەنی چەندین نامیلکە و کتێبی دەگمەن بووە و چاپخانە و تەکنۆلۆژیاییش هێشتا لە کۆمەڵێکی خێڵەکی رۆژهەڵاتی دواکەوتوو هێندە زۆر نەبوو.

نۆڤیلێتەکانی ئەو بەهرەمەندە بە زمانێکی سادە و نزیك لە گێڕانەوەی حیکایەتەوە دەستی پێکرد و زیاتر بۆ خستنەڕووی ناوەرۆکەوە بووە، (مام هۆمەر) هەوڵدانێکە بۆ شۆڕبوونەوە بە ناخی کەسانێکی رژد و چنۆك و شیکردنەوەی باری شڵەژاوی دەروونیی ئەو کەسانەی تەنیا و تەنیا بەرژەوەندی خۆیان لەبەرچاو دەگرن. بابەتە سیاسییەکانی رۆژ لە دیدی ریالیزمی رەخنەگرانە و سۆسیالیستیانەی کەسێکی شارەزا بە فەلسەفەی مارکسیەت وەکو (محەرەم محەمەد ئەمین) نووسراوەتەوە، گۆڤاری "هەتاو"، لە ژمارەی (٨)ی ساڵی (١)، لە ٣٠ی ئاغستۆسی ١٩٥٤، وەها چیرۆکی (مام هۆمەر) بۆ خوێنەرانی دەخاتە ڕوو:

"ئەگەر حەزدەکەی لە دراوسێی دەوڵەمەند و بێ خێر و چرووك و نامەرد بگەی چیرۆکی مام هۆمەر یادگاری محرم افندی بخوێنەوە لە سلێمانی دەفرۆشرێ."

ناوەرۆکی بەرهەمە ئەدەبییەکانی بەشێوەیەکی گشتی، بیرکردنەوەی کەسێکی یاخییە لە ژیان، یاخی بوون بەو ئومێدەی باوەڕی تەواوی بە ژیانێکی جوانتر و پاکتر و بەسەفاتر هەیە لەوەی کە هەیە و دەبێ بگۆڕدرێت، بەتایبەتی لە وتارە رۆژنامەوانییەکانیدا ئەوە بە ئاشکرا دەردەکەوێت، لە گۆڤاری "هەتاو"، بە ناونیشانی "زیندوو لە ژیان بێزار نابێ"، گلەیی لەو کەسانە دەکات کە لە مردن دەترسن و ئومێدی بە کار و خەبات و چالاکی مرۆڤ هەیە لە پێناو ئامانجێکی پتر بۆیە دەڵێت:

ئێمە بە خەبات و کار و بەرپرسیارەوە ئەژین ئیتر مەرج نییە سەرکەوین یا ژێرکەوین، چونکە ژیانێکی سەرکەوتوو هەوڵدانە بۆ گەیشتنە ئامانج پترتر لەوەی گەیشتنە ئامانج بێ. ئەوانەی هەر کاتە ناکاتێك ئەپرسن کامەرانیی چییە و لە چ رێگایەکەوە دەستگیر ئەبێ ئەمانە تامی ژیانیان لە کیس چووە چونکە بەبێ خەبات و کردەوە ئەژین...تاد. (هەتاو، ژ ١٢١، س ٤، ١٩٥٨)

تێڕوانینی نیشتیمانپەروەری و کوردپەروەری ئەو بەشێوەیەك بووە، هاوکاری لەگەڵ زۆربەی رۆژنامەکانی ئەو سەردەمە کردووە، لە شارەکانی کوردستان، لە رۆژنامەی "ژین" لە سلێمانی و "هەتاو" لە هەولێر، دواتریش لە گۆڤاری "رۆژی نوێ" ، ئەزموونێکی دەوڵەمەندی پێشکێش کردووە و ناوەرۆکی وتارەکانی لایەنی مێژوویی و سیاسی و رەخنەی ئەدەبی لەخۆگرتووە، ئەمە بێجگە لەوەی وەکو ئەندامی دەستەی نووسەرانی گۆڤارەکە لەپاڵ (کامەران موکری و ئیحسان فوئاد و کەریم زەند و عەبدوڵڵا ئەژدەر) دا کاری کردووە و ئەم گۆڤارەش یەکێکە لە گۆڤارە دەوڵەمەند و پڕ لە زانیارییەکانی دنیای رۆژنامەوانی کوردی، کە وێنەی شارەزایی ئەو ئەندامانە لە رپۆرتاژ و هەواڵ و رێکلام و گۆشەی تایبەت و ستوونی رۆژنامەوانی و دیزاین و هونەرەکانی تری رۆژنامەوانی پیشان دەدات.

ناوەرۆکی وتارەکانی (محەرەم محەمەد ئەمین) ، بەهرەی ئینسکلۆپیدیی ئەو دەنوێنن، زۆر بە دەگمەن نووسەر و وتاری کوردی لە رۆژنامەوانی کوردیی کۆتایی پەنجاکان و شەستەکاندا بەرچاو دەکەوێ بەوردی و تێگەیشتنەوە باسی پێوەندی

دەروونناسی و ئەدەبی کرد بێت، تەنانەت تاوەکو ئەمڕۆش وەکو پێویست بەشێوەیەکی ئەکادیمی بە نووسین و وەرگێڕان ئەو بابەتانەی بنیاتی دەقی ئەدەبی لەسەر دەسکەوتەکانی تیۆری دەروونشیکاریی فرۆیدی شی دەکەنەوە دەگمەنن. لە ژمارە (٢)ی گۆڤاری "رۆژی نوێ" دا لە ساڵی ١٩٦١ دا "زانستی دەروون و ئەدەب" ی بە کوردییەکی سادە و رەوان تەرجەمە کردووە و زانیاری وردی تێداهاتووە.

لایەنێکی تری ئەزموونی رۆژنامەوانیی ئەو، "گۆشە نووسییە" لە رۆژنامەوانی کوردیدا. لە رۆژنامەی "ژین"دا، گۆشەی "رێگای راست"ی نووسیوە و تیایدا بابەتی سیاسی و کۆمەڵایەتی خستۆتەڕوو. لە گۆشەیەکیدا بە زمانێکی ورد و خەست و چڕ، بە ئابووریکردن لە وشەدا، بە سەرەتا و ناوەند و کۆتاییەکی قەناعەت بەخش، کە لە مەرجە هونەرییەکانی گۆشەنووسینن، بابەتەکەی خۆی پێشکێش کردووە ، بابەتەکەیش سەبارەت بە هەڵبەستنی ناووناتۆرەیە کە خەڵکی هیچ لەبارنەبوو، یان خاوەن بیروباوەڕ و ئایدیایەکی دیاریکراو بێ رەچاوکردنی سەربەستی تاکەکەسیی و لەسەر بنچینەی ئەوەی لەگەڵم دا نەبێت دوژمنمە، هەڵوێستی هەڵە و پڕ لە کەم و کورتیی خۆیان دەردەبڕن، بەڵام ئەلتەرناتیڤی ئەوە بۆ دەبێ بیر لە برایەتی و یەکسانی و دادپەروەری نەکەنەوە، بۆ دەبێ خەڵك بە جاسووس و خەفیەی بێگانە لە قەڵەم بدەن؟ لەو گۆشەیەدا هاتووە:

بە تاقیکردنەوە سەلماوە، ئەوانەی ناووناتۆرەی خراپ ئەخەنە دوای خەڵکی خۆیان لە خۆیانا دڵیان کرمێ و پڕ گرێ و گۆڵە... ئەیانەوێ بەوە بوونی خۆیان ئاشکرا بکەن... چونکە وادەزانن خەڵکی بە هیچیان نازانێ، یا خۆیان بە کەمتر ئەزانن لە هەندێك کەسی تر... ئەیانەوێ بە ناتۆرەی ناشیرین ئەوانە بشکێنن و خۆیان دەربکەون...هەموو کەسێ زۆر یا کەم کەموکووڕی تێدا هەیە، بەڵام هەندێك کاری باشی لەباردا هەیە... بەو کارە باشە کەموکووڕییەکەی خۆی دائەپۆشێ و ناوی خۆی بەرز ئەکاتەوە... هەندێکی تریش هەر هیچیان لەباردا نییە، لەبەر ئەوە ناچار ئەبن دەست بدەنە کردەوەی خراپ. هەر بۆ ئەوەی بووترێ هەن.

ئەوەی لە دووتوێی نووسینەکانی ئەم نووسەرەدا خۆی دەنوێنێ، ڕوانگەی قووڵ و بیری فەلسەفەی ئەون، بە زمانێکی سادە، بەڵام قووڵ لە ناوەڕۆکدا، وەکو ڕۆشنبیرێکی خاوەن پەیام هەستی بەوە کردووە دەبێ چی بنووسێ و چۆن بنووسێ؟ لەو کاتانەی دوژمنانی کورد، جەژنی نەورۆزیان لە کورد قەدەغە کرد و دژایەتی کوردیان دەکرد، (محەرەم محەمەد ئەمین)، حەوت وتاری جیاجیای لە ڕۆژنامە و گۆڤارەکانی (ژین، سلێمانی، نەوروز، ڕۆژی نوێ) بە تێڕوانینێکی سەردەمیانەوە لەبارەی گرنگی و پایەی نەورۆز وەکو سیمبولێکی نەتەوەیی ناساندووە، نەورۆز وەکو شۆڕشێکی بەردەوام سەیر دەکا، هەر ئەوە نییە، ڕووداوێك لە ڕابردوو بووە و تەواو، بەڵکو بەردەوامی هەیە، بۆیە لە گۆڤاری (ڕۆژی نوێ، ژ ١٢، س ١، ١٩٦١) دا دەڵێ:

نەورۆز ئەو ئاگرە پیرۆزەیە هەمووساڵێك ئەگەڕێ بە کوردستاندا بۆ گەشکردنەوەی پشکۆی خەباتمان و بەرزکردنەوەی گڕی شۆڕشی ڕزگاریمان...لە هەموو نەورۆزێکدا تێکۆشانی نەتەوەکەمان پێ ئەنێتە قۆناغێکی تری بەرزتر لە سەرکەوتنیا بەسەر ئەو هەورازە سەختەی ئەبێ بیبڕێ، تا بگا بە هەموو ئامانجەکانی خۆی، کەوا بێ جەژنی نەوروز ڕۆژی بەسەرکردنەوەی خەباتی ڕابردوومانە، ڕۆژی دەست نیشانکردنی سەرکەوتن و ژێرکەوتنمانە، ڕۆژی دۆزینەوە و جیاکردنەوەی هەڵە و ڕاستمانە، بۆ ئەوەی لە ساڵی نوێدا بەهێزتر و تواناتر و چالاکتر بزووتنەوەی ڕزگاریمان ببەین بۆ پێشەوە.

(محەرەم محەمەد ئەمین) ، وەکو کەسایەتییەکی ڕۆشنبیر و پێشکەوتنخواز باوەڕی تەواوی بە ئازادی و سەربەستی ئافرەت و مافەکانی هەبووە و لەو ڕۆژگارەدا وەکو کەسێکی بوێر، تەنانەت ڕووبەڕووی نەریت و پیاوانی ئایینی بۆتەوە. لە وتارە ڕۆژنامەوانییەکانیدا ئەو بابەتەی ورژاندووە، کە بەڵگەی تێگەیشتن و ڕامانی قووڵی ئەوە بۆ تێگەیشتن لە یاساکانی پێشکەوتنی کۆمەڵایەتی بۆ بەرژەوەندی نەتەوەیی و باوەڕهێنانە بە کۆمەڵگایەکی دیموکراسی و سەربەخۆ:

مەبەست لە سەربەستی ئافرەت ئەوەیە ڕێگای هەبێ ئەو بەهرە و وزە و توانایەی هەیەتی نەیفەوتێنێ و ...بیخاتە کار بۆ سوودی نەتەوەکەی نەك سەربەست بێ بۆ کردەوەی هیچ و پووچ و بێ ڕەوشتی.

گۆڕین و پێشکەوتنی ژیان و ڕووپۆش و عەبا فڕێ ئەدا بمانەوێ یا نەمانەوێ ...بەڵگەش بۆ ئەم قسەیەم بەراوردکردنی ژیانی کۆمەڵایەتی ئێستامانە لەگەڵ پەنجا ساڵ لەمەوپێش. (ڕۆژنامەی ژین، ژ ١٧، ١٩٧١).

ئەم نووسەرە، چەندین وتاری ڕۆژنامەوانیی بۆ سەربەستی گەلانی عێراق و ڕزگاربوونی لە سیاسەتی ئینگلیز و ڕژێمی پاشایەتی نووسیووە، بەتایبەتی شۆڕشی ١٤ی تەمووز بە خاڵی وەرچەرخانێکی گەورە دادەنێ بۆ سەرەتای پێکەوە ژیانی کورد و عەرەب لە سایەی جمهوریەتدا.

**هەولێر ٣/١/٢٠١١**

==================================================


**سەرچاوەکان:**

- محەرەم محەمەد ئەمین، کۆبەرهەمە ئەدەبی و سیاسی و فەلسەفییەکانی، چاپی یەکەم، ٢٠٠٨.
- ژمارەکانی گۆڤاری هەتاو، چاپکردنەوەی سدیق ساڵح و ڕەفیق ساڵح و عەبدوڵلا زەنگەنە، هەولێر: دەزگای موکریانی ، ٢٠١٠.

# ئەوانەی ژیانیان لە دوای مردنیانەوە دەست پێدەکات

وتاری کەریم شارەزا

سەرۆکی یەکێتی نوسەرانی کورد - لـقی هەولێر

هەرچەندە لە کاتی رووداوانی کارەساتی دڵتەزێن، ماوەی بیرکردنەوە تەسك دەبێتەوە و هێزی پەنجەی نووسین نامێنێ و ئاهی دەروون رێگە لە دەربڕینی وشەی شایستەی ئەم رووداوە دەگرێ. بەلاّم کۆستی گەورە و کاریگەر مرۆڤی هەست ناسك دێنێتە هەژان و چەند ڕاز و هەستێکی دەروونی پێ دەردەبڕێ و ئێمەش لە ئاست کۆستی ئەمجارەماندا خۆمان پێناگیرێ و بە چەند وشەیەکی سادە پرسە و دلّدانەوەی سەرجەم ئەندامانی یەکێتی نووسەرانی کورد- لقی هەولێر پێشکێش بە بنەماڵەی کەس و کاری خوا لێخۆشبوو محەرەم محەمەد ئەمین دەردەبڕین، لەگەلّ رێز و سوپاسمان بۆ یەکێتی نووسەرانی کورد- لقی سلێمانی بۆ گێڕانی ئەم چلە ماتەمینە، تاکو بتوانین دەرفەت وەدەست بێنین و بەشداریەکی بچووك لە یادکردنەوەی کۆچی دوایی ئەم ئەدیبە مەزن و نەمرەی کوردمان بکەین و چەند راز و فرمێسکێکی ئەمەکداریی بۆ دابارێنین.

ماتەمگێران.. هەندێ لە بیرمەندان فەلسەفەی ژیان لەو هێڵە بچکۆلە باریکەدا دەبینن کە لەدوای مردندا لەسەر کێلی گۆڕی مردووان لەنێوانی سالّی لە دایکبوون و مردندا دەکێشرێ و هەموو رووداوەکانی ژیانی مرۆڤ لە خۆشی و ناخۆشی و لە چاکە و لە خراپە و لە خزمەتگوزاری و خەبات و بەرخودان لەو هێڵە کورتە سیحراوییەدا بە نادیاری تۆمار دەکرێن. ئەگەر ئەم بۆچوونە فەلسەفیە بۆ مرۆڤی ئاسایی بەڕاست بگەرێ، ئەوا بۆ مرۆڤی زانا و ئەدیب و هونەرمەند و خەباتگێڕ و خزمەتگوزاری نەتەوە و نیشتمانەکەی ناتوانین بلّێین بەڕاست دەگەرێ چونکە ئەو جۆرە کەسانە نەك هەر هێڵی ژیانیان بۆ دوای مردنیشیان درێژ دەبێتەوە، بەلّکو دەتوانین بلّێین ژیانیان لە دوای مردنیانەوە دەست پێ دەکات، چونکە

له ڕێگەی کرداری باش و بەرهەمی بە کەڵك و خزمەتگوزاریانەوە بۆ کۆمەڵ جێگەیەکی دیاریان لە ناو رۆڵەکانی نەتەوەکەی کردۆتەوە و بە نەمریی دەمێنێتەوە.

مامۆستا محەرەم محەمەد ئەمین نموونەیەکی دیار بوو لە ناو ئەو جۆرە مرۆڤە خزمەتگوزارانە و لە ساڵی ١٩٢١دا لە شاری سلێمانی چاوی ژیانی هەڵهێناوە و خوێندنی تاکو قۆناغی ئامادەیی و وەرگرتنی بڕوانامەی دەرچوون بووە.

لە ساڵی ١٩٤٣دا کراوە بە فەرمانبەر و لەسەر هەڵوێستی سیاسی گەلێك جار گیراوە، بەڵام کۆڵی نەداوە و بەردەوام بووە لەسەر خەباتی کوردایەتی. زنجیرەیەك لە کۆمەڵە چیرۆکی ریالیستی داناوە و پەخشی کردوون و ژمارەی کتێبە چاپکراوەکانی دەگاتە (٩) بەرهەم کە ئەمانەن:

١- چیرۆکی مام هومەر – هەولێر ١٩٥٤
٢- چیرۆکی گردی شەهیدان- چاپی یەکەم - سلێمانی ١٩٥٨، چاپی دووەم ١٩٧٠
٣- چیرۆکی یادی گۆڕستانەکە – وەرگێران لە عەرەبیەوە – بە غدا ١٩٥٨
٤- چیرۆکی گۆمی شڵەقاو – بەغدا ١٩٥٧
٥- ڕێگای ئازادی – سلێمانی ١٩٥٩
٦- شۆڕشی بەرزان (وەرگێڕان لە عەرەبیەوە) سلێمانی ١٩٥٩
٧- ئادەمیزاد (چیرۆك) – سلێمانی ١٩٦٩
٨- مەبدەئە بنەرەتییێکانی فەلسەفە – سلێمانی١٩٦٠
٩- مافی بڕینەوەی دوارۆژ – (وەرگێرانە لە عەرەبی) سلێمانی ١٩٧٢

ئەم نووسەرە خامەڕەنگینە نموونەیەکی دیاربوو لە ناو ئەو جۆرە مرۆڤە خزمەتگوزارانە و بەسەربەرزیی ژیا و بەسەربەرزیش لە تەمووزی ١٩٨٠ دا بە نەخۆشی دڵ لەم جیهانە پڕکێشەیە دەرچوو و چووە جیهانی نەمرانەوە. لەڕێگەی بەرهەمە بە پێزەکانیەوە ژیانی کۆتایی پێ نەهاتووە و هەر بەردەوامە و تا چیرۆکەکانی بخوێنرێنەوە ناوی پاکی و بەرهەمی پتەو و چاکی لە تۆماری ویژدانی گەلی کورددا ناسڕێنەوە و هەردەم یادی بە خێری دەکرێتەوە.

---

* ئەم وتارە لە ڕێکەوتی ئابی ١٩٨٠ لە چلەی ماتەمی خوێنراوەتەوە

## مع أعلام الكورد: القاص الواقعي الريادي محرم محمدامين (١٩٢١-١٩٨٠)

كريم شارەزا

هو القاص الواقعي الريادي و المترجم والمناضل الوطني المعروف محرم محمد امين، ولد في مدينة السليمانية سنة ١٩٢١، نشأ في اسرة محبة للعلم و الادب، دخل المدرسة الابتدائية سنة ١٩٢٨، واكمل هذه المرحلة من الدراسة و مرحلتي المتوسطة و الاعدادية في مدن شقلاوة و رواندوز و زاخو و السليمانية لكون والده موظفا حكوميا في تلك المدن الكوردية. ونال شهادة التخرج من الاعدادية سنة ١٩٤١، ثم ذهب الى بغداد ليدرس في كلية الحقوق، فقبل فيها وواضب على الدوام مدة، الا انه بسبب نشاطه السياسي و انتمائه الى تنظيمات الحركة التحررية الكوردية، أعتقل مرات عديدة و بعد اطلاق سراحه لم يسمح له بالدوام في كليته بسبب محكوميته، لذا اضطر الى ترك دراسته الجامعية و حاول التوظيف في احدى دوائر الدولة. فعين بعد محاولات عدة موظفا في مديرية معارف محافظة السليمانية، ثم نقل الى المكتبة العامة هناك لكنه فصل من وظيفته لكونه مناضلا وطنيا يجاهد في سبيل اعلاء شأن وطنه كوردستان وامته الكورد.

فاضطر عندئذ للعمل في فرق مكافحة الملاريا مدة، الى ان عين من جديد سنة ١٩٧٤ مديرا لبلدية السليمانية و بعد سنة واحدة عين بصفته اديبا ذا خبرة صحفية جيدة، موظفا في دار الثقافة و النشر الكوردية ببغداد سنة ١٩٧٥، فاختير سكرتيرا لتحرير مجلة (بەیان) الصادرة من تلك الدار و اشرف على اصدار المجلة من العدد (٢٦) الصادر في حزيران ١٩٧٥ الى العدد (٣٥) الصادر في نيسان ١٩٧٦، فطور المجلة بنشر دراسات أدبية قيمة عن الادب و التراث الكوردي و العالمي من شعر و قصة و غيرها

واحيل على التقاعد سنة ١٩٧٦ بناء على طلبه ليعود الى مسقط رأسة السليمانية لأكمال مشاريعه الادبية من تأليف و ترجمة.

كان الراحل عضوا في جمعية الفنون و الأداب الكوردية و عضوا بارزا في اتحاد الادباء الكورد و كذلك عضوا في هيئات تحرير مجلات و جرائد كوردية عديدة منها (الشفق) و (رۆژى نوێ — اليوم الجديد) و (السليمانية) و (بيان) و (نوروز) و (برايەتی) و (ژين) و كان منتميا الى الحزب الديمقراطي الكوردستاني بعد تأسيسه برئاسة البارزاني الخالد في ١٦/٨/١٩٤٦، وابدى نشاطا ملحوظا فيه و كان له دور متميز في تنظيم تظاهرات جماهرية فی السليمانية المطالبة بالحقوق القومية للشعب الكوردي و الحريات الديمقراطية و تحسين الاحوال المعاشية لكادحي شعبه، لذا كان هدفا لملاحقة الشرطة السرية فی العهد الملكي والاعتقال مرات عديدة و بعد انقلاب ٨ شباط ١٩٦٣ تعرض الى السجن و التعذيب من جديد بسبب مواقفه الوطنية التقدمية و تعرض كذلك بعد اندلاع ثورة كوردستان من جديد في ١٩٧٦ الى الملاحقة و استدعى الى مديرية امن السليمانية، بسبب مواقفه الوطنية و لمحاسبته على التحاق ابنه بصفوف الثوار المناضلين الكورد. فاصيب من جراء مضايقته و تعذيبه بنوبة قلبية حادة لم تمهله كثيرا حين فارق الحياة فی المستشفى يوم ١٥/٧/١٩٨٠ عن عمر ناهز التاسعة و الخمسين عاما. كان الراحل قاصا واقعيا و مترجما جيدا غزير النتاج، طبع مجموعة من قصصه الواقعية و دراساته و تراجمه باللغة الكوردية، اهمها:

١- قصة (مام هومەر) طبعت في اربيل ١٩٥٤.
٢- قصة (گۆمی شلەقاو) (البحيرة المتلاطمة) ١٩٥٧.
٣- قصة (گردی شەهیدان) — (تل الشهداء) ط (١) ١٩٥٨، ط (٢) ١٩٧٠.
٤- قصة (یادی گۆرستانەکە) — (ذكرى المقبرة) ترجمها من العربية، طبعت ١٩٥٨.
٥- قصة (ڕێگای ئازادی) — (طريق الحرية) ١٩٥٩.
٦- شۆرشی بەرزان (ثورة بارزان) مترجمة من العربية ١٩٥٦.

٧- (مەبدەئە بنەرەتییەکانی فەلسەفە) – (المبادئ الاساسية للفلسفة) ١٩٦٠.

٨- قصة (ئادەمیزاد) – (الانسان) طبعت ١٩٦٩.

٩- (مافی برینەوەی دوارۆژ) – (حق تقرير المصير) مترجمة من العربية.

وقد اقام اتحاد الادباء الكورد فرع السليمانية بمناسبة اربعينية وفاته حفلا تأبينيا له يليق بمكانته الادبية و الوطنية في مساء ١٩٨٠/٨/٢٣ فى حدائق مقره في شارع كوران، القى خلاله ممثلو فروع الاتحاد و المركز العام كلمات تأبينية اشادت بنضاله الوطني و منزلته الادبية و الثقافية الرفيعة.

==================================================

**المصادر:**

١- عمر ابراهيم عزيز (دیاری نەورۆز لە پەخشانی کوردی دا) اربيل ١٩٨٤.

٢- نزار-اعداد رفيق صالح دراسه و فهرسه – صديق صالح السليمانيه ٢٠٠٠ ص ١٦

٣- مصطفى نريمان- معجم المؤلفين الكورد- بغداد ١٩٨٦.

## دیمانەیەك لەگەڵ محەرەم محەمەد ئەمین دا

**دیدار: مستەفا ساڵح کەریم**

**ـ مامۆستا محەرەم ئەمانەوێ بزانین سەرەتای ژیانی ئەدەبیتان لە کەیەوە دەست پێ ئەکات؟**

+ سەرەتای ژیانی ئەدەبیم لە چلەکانەوە دەستپێدەکات. لە ساڵی ١٩٤٨دا هەندێ لە چیرۆکەکانی (گۆرکی و گۆگۆڵ) و چەند چیرۆکنووسێکی جیهانی ترم کرد بە کوردی و بەرەبەرە لە رۆژنامەی (ژین و هەتاو)دا بڵاوم دەکردنەوە، لەگەڵ هەندێ وتاری ئەدەبی و کۆمەڵایەتیدا.

**ـ مامۆستا ئێوە بۆچی لە ئەدەبدا چیرۆکتان هەڵبژارد ؟ بۆچی شیعر، یان شتێکی ترتان هەڵنەبژارد ؟**

+ چونکە بە رای من چیرۆك لە هەموو بەشەکانی تری ئەدەب دەرفەتی زیاترە بۆ شیکردنەوەی ژیانی کۆمەڵایەتی و ئاشکراکردنی کەموکورییەکان و دیاریکردنی رێگای چارەسەرکردنیان.

**ـ مامۆستا بۆچی چیرۆك لای ئێوە بریتییە لە چی؟**

+ بەلای منەوە چیرۆك بریتییە لە ئادەمیزاد و کارەسات و کات بە تێکەڵبوون دروست دەبێ. بەیەکداچوونی ئەمانە و ئەو کۆك و ناکۆکییانەی لێوەیان پەیدا دەبێ، جا لێرەدا نرخی چیرۆك لە رووی تەکنیك و دارشتن و ئامانجەوە دەگۆرێ بەپێی بەهرە و شارەزایی و ئایدیۆلۆژیای نووسەرەکە.

**ـ مامۆستا محەرەم لە سەرەتادا کێبوون ئەو چیرۆکنووسانەی کاریان تێکردی؟**

+ ئەو چیرۆکنووسانەی لە سەرەتادا کاریان تێکردم ئەمانەن: گۆرکی، گۆگۆڵ، ئەناتول فرانس، دیکنز، نەجیب مەحفووز.

**ـ باشە. جیاوازی چییە لە نێوان چیرۆکی پەنجاکان و چیرۆکی ئەم سەردەمەدا، بەو سیفەتەی کە جەنابتان یەکێکن لەو چیرۆکنووسانەی لە پەنجاکانەوە چیرۆك دەنووسن؟**

+ بە بێگومان، لە پەنجاکانەوە تا ئەم سەردەمە گۆڕینێکی قووڵ ڕووی داوە لە ژیانی کۆمەڵایەتی و سیاسی و ئابووریماندا. ئەمە کارێکی گرنگی کردۆتە سەر بەرهەمی ئەدەبیمان بەجۆرێکی گشتی و بەرهەمی چیرۆك بەتایبەتی، لە پەنجاکاندا چیرۆك بەشێوەی هونەریی تازە سەری دەرهێنا. ژیانیشمان لە ڕادەی ئێستادا نەبوو، چیرۆکی پەنجاکان لە ڕووی بابەت و شێوەوە پڕ بەپێستی ئەو سەردەم بوو. لە ڕووی شێوەوە ڕێگای گێڕانەوە، یانی (سەرد)ی ئەگرت، لەگەڵ ڕاوێژ و ئامۆژگارییەکانی نووسەر، کە دەیئاخنییە چیرۆکەکەیەوە. بەواتا پێش کات. لە شێوەی حیکایەت ڕزگاری نەبوو. بەڵام چیرۆکی ئەم سەردەمە تا ڕادەیەك لە ڕووی داڕشتن و شێوە و ناوەڕۆکەوە لەو قاڵبە ڕەتبووە.

**ـ باشە ئێوە وەك چیرۆکنووسێك کە لە پەنجاکانەوە چیرۆك ئەنووسن و ئێستاش هەر چیرۆك ئەنووسن، ڕاتان چییە بەرامبەر بە تازەکردنەوە لە چیرۆکی کوردیدا؟**

+ وەکو دەزانین ژیان هەمیشە لە تازەبوونەوە و گەشەکردندایە. ئەگەرچی جاروبارە هەندێ قۆرتی دێتەبەر، چیرۆکیش کە لە ژیانەوە هەڵدەقوڵێ، لەم یاسایە بەدەر نابێ. بەڵام بەداخەوە هەندێ لە گەنجەکانمان دەیانەوێ لەسەر ئەو واقیعەی تیا دەژین بەزۆرەملێ بازبدەن. لەبەر ئەوە بەرهەمەکانیان دەبێتە لاساییکردنەوەی بەرهەمی نووسەرە بێگانەکان، بەڵام بەشێوەیەکی کاڵ و کرچی بێتام، وەك کورد گوتەنیەکەی بەسەردا دەگونجێ، کە دەڵێ: (کەر لەکوێ کەوتووە و کوندە لە کوێ دڕاوە!)

**ـ باشە مامۆستا! هەر لەسەر ئەم پرسیارەوە پرسیارێکی تر هەیە. هەندێك بەناوی تازەکردنەوە چیرۆکی وا ئەنووسن کە خوێنەر تێی ناگات. تۆ ڕات چییە بەرامبەر بەم دیاردەیە و بە تەمومژی دەستکرد لە چیرۆکدا؟**

+ ئەم تازەکردنەوەیە ئەگەر سروشتی بێت، یەعنی تەبیعی بێت و بگونجێ لەگەڵ قۆناغی ئێستاماندا و دووربێت لە لاساییکردنەوەی کوێرانە شتێکی نەك هەر بەجێیە، بەڵکو پێویستیشە، بەڵام مەسەلەی تەمومژ ئەوە بەلای منەوە شتێك نییە لەجێی خۆیدا بێ، چونکە ئێمە کە چیرۆك دەنووسین دەبێ هەموو، یان زۆربەی خەڵکی تێی بگات، من کە تەمومژم بەسەر چیرۆکەکەدا دا، مانای ئەوەیە، یان کەس تێی ناگا. ئەبێ خۆم چیرۆکەکەم بۆ خەڵك شەرح بکەم، یان ئەگەر تێشی بگەن دەستەیەکی زۆر کەم تێیدەگا، کە سوودێکی ئەوتۆی نابێ.

**ـ کاك محەرەم! ئاسۆی ڕۆشنبیری ئێستا چۆن بەدی ئەکەن؟**

+ من باوەڕم بە پێشکەوتن و گەشەکردن هەیە، ئەگەرچی جاروبار بەموەقەت کۆسپ و گیروگرفت دێتە پێشەوە. لەبەر ئەوە ئاسۆی ڕۆشنبیری کوردی بەرەو گەشەسەندن دەڕوا.

**ـ کاك محەرەم، ئێستا دەتانخەینە سەر سەکۆی دانپیانان، ڕات چییە بەرامبەر بەم چیرۆکنووسانە؟**

*** جەمال بابان.**

+ ناتوانم وا بەسەر پێوە وەڵامی ئەم پرسیارەتان بدەمەوە، ئەمە لێکۆڵینەوەیەکی دوورودرێژی دەوێ، خوا یاربێ لە دەرفەتێکی تردا بەیەك دەگەینەوە و وەڵامی ئەم پرسیارەتان ئەدەمەوە.

**ـ بەڵام مامۆستا ئێمە نامانەوێ تۆ بەدرێژی تەحلیلی چیرۆکەکانیان بکەیت، شیانبکەیتەوە. ڕات چۆنە؟ ئەم چیرۆکنووسە سەرکەوتووە؟ چۆنە؟ وەکو برووسکە پێمان بڵێ؟**

+ بەخوا ئەزانی چییە. ڕاستت دەوێ ئەوانە هەرچ کەسە دەوری خۆی نواندووە، بەعزێکیشیان هێشتا دەوری خۆیان هەیە، بەعزێکیشیان دەوری خۆیان بووە و هەیە. بەعزێکیان لە پەنجاکاندا، بەعزێکیان تازەن، لەبەر ئەوە وەکو وتم ئەمانە لێکۆڵینەوەیان ئەوێ. بەراوردی بەرهەمیان پێویستە بکرێ لەگەڵ یەکدا،

بزانین ئەوانە ئایا لە ڕووی تەکنیکەوە، ئایا لە ڕووی دارشتنەوە، لە ڕووی هینەوە شتێکیان تیا هەیە، ئەمیان کەموکووڕی تیا هەیە. ئەویان هەروەکو وتم لەوەپێش بەعزێکیشیان ئەمومژیان تیا هەیە ڕوونکردنەوەی ئەوێ، ئەمانە جارێ وەختیان نییە.

- بەڵام هەرچۆنێك بێت لەسەر کورسی (ئیعتراف) دانانیشی؟

+ ناوەڵڵا، مەسەلەکە عیلاقەی بە دیراسەیەکی مەوزووعیەوە هەیە.

- ئەو بەرهەمانەی کە تا ئێستا چاپت کردوون کامانەن؟

+ ئەو بەرهەمانەی تا ئێستا چاپم کردوون ئەمانەن: مام هۆمەر، گۆمی شڵەقاو، ئادەمیزاد، شای قەرەجەکان، گردی شەهیدان، یادی گۆڕستانەکە (وەرگێڕدراوە).

- ئەی ئێستا چیتان بەدەستەوەیە؟

+ ئێستا چیرۆکێکی درێژم بەدەستەوەیە، دەمەوێ لەگەڵ چەند چیرۆکێکی تردا، کە لە گۆڤار و ڕۆژنامەکاندا بڵاومکردوونەتەوە، کۆیان بکەمەوە و لە دووتوێی کتێبێکدا چاپیان بکەم.

- ئەمەی بەدەستەوەیە وەکو بڵێین چیرۆکی درێژە، یان ڕۆمان؟

+ ڕۆمان.

- جا کە ڕۆمانە، بۆ بەجیا بڵاویان ناکەیتەوە، بۆ لەگەڵ ئەوانە تێکەڵیان دەکەی؟ ئەوانەی تر بەکۆمەڵێکی تر بەجیا ئەویش بەجیا.

+ بەخوا ئەوی بەدەستمەوەیە نیازم هەیە بیدەم بە کۆڕی زانیاری کوردی، جا ئەوان کەیفی خۆیانە، یێ جیای ئەکەنەوە، یان بەیەکەوە چاپیان ئەکەن.

- جا تۆ ئەتوانی بەجیا چاپیان بکەی.

+ وەڵڵا نازانم.

- مامۆستا محەرەم! بەو سیفەتەی لە یەکەم ڕۆژی دامەزراندنی یەکێتی نووسەرانی کورددا، لە سلێمانی جەنابتان ئەندامی دەستەی بەڕێوەبەری لق بوون، ڕات چییە بەرامبەر بەدەوری یەکێتی لە گەشەکردنی ئەدەبی کوردیدا؟

+ گومانی تێدا نییه كه یەكێتیی نووسەرانی كورد دەورێكی زۆر باڵای هەبووه و هەیەتی له گەشەپێدانی ئەدەبیی كوردی و زیندووكردنەوەی كەلەپووری نەتەوایەتیماندا.

ـ كاك محەرەم! ئایا موتابەعەی بزووتنەوەی ڕۆشنبیری بە گۆڤار و ڕۆژنامەكاندا ئەكەن؟

+ بەڵێ موتابەعەی دەكەم، بەداخەوە بەشێكی كەمی لێ دەرچێ ئەوانی تر نەك هەر بە بەرهەمی ئەدەبیی ناژمێردرێن، بەڵكو لە ئاستی وتارێكی ئاساییشدا نییە. ئەمەش خەتای گۆڤار و ڕۆژنامەكانمانە. بەناوی هاندانەوە دەرگایان كردۆتەوە بۆ هەر كەسێك دەستی قەڵەم بگرێ، بەلای منەوە ئەمە جەورە لە ئەدەبی كوردی دەكرێ، جەوریش لەو لاوانە دەكرێت گوایێ لەپڕ بوون بە ئەدیب و نووسەر.

ـ كاك محەرەم! ساڵی ١٩٥٧ ـ ١٩٥٨ بەپێی ئەو بار و زرووفە دەورێكی گرنگی هەبوو لە بڵاوكردنەوە و بزووتنەوەی ئەدەبی كوردیدا، ئێوە ڕاتان چییە؟

+ بەڵێ منیش لەو باوەڕەدام ساڵێكی بەهات بوو بۆ ئەدەبی كوردی و بەتایبەتی لە كۆتایی ساڵی ١٩٥٧ دا تا كۆتایی ساڵی ١٩٥٩.

ـ كاك محەرەم! ئێمە پرسیارمان زۆر كرد. ئێوە هیچ پرسیارێكتان هەیە؟ ئێوە هیچی تر هەیە كه بیلێێن لەم بەرنامەیەدا؟

+ بەراستی مامۆستا پرسیارەكانت هەموو لایەنێكی گرتەوە و هیچی تری وانییە بیلێم. تەنها ئەوەندە نەبێ، خۆزگە وەكو جاران گۆڤارێك، یان ڕۆژنامەیەك لە شاری سلێمانی دەردەچوو و دەزگای ڕۆشنبیری و كۆڕی زانیاری كوردی و وەزارەتی ڕاگەیاندن زیاتر یارمەتی ئەدیب و نووسەرەكانیان ئەدا بۆ چاپكردنی بەرهەمەكانیان.

---

* ئەم چاوپێكەوتنە ساڵی ١٩٨٠ لە ڕادیۆی بەغدا بۆ بەرنامەی شەوچەرەی ئەدەبی سازكرابوو.

## هەڵدانەوەی چەند لاپەڕەیەکی شاراوە لە ژیانی چیرۆکنووسی شەهید (محەڕەم محەمەد ئەمین)

(محەڕەم محەمەد ئەمین) یەکێکە لەو چیرۆکنووسە بەتوانا و بەهرەمەندانەی کورد کە خاوەن رۆشنبیرییەکی فراوان و بەربلاو بوو. نووسەرێکی بەهرەمەند و سیاسیەکی راستگۆ بوو. هەروەك چۆن لە سیاسەتدا رۆڵی بەرزی ئەو فەرامۆش کراوە ، لە بواری چیرۆکنووسینیش بە هەمان شێوە رۆڵی مەزنی ئەو بایەخی پێنەدراوە. ئەمەش لەبەر ئەوە نییە کە ئەو شایەنی بایەخ پێدان نییە ، بەڵکو لەبەر ئەوەیە کە ئەو لە باروودۆخێکی ناهەموار بەدەستی دوژمنانی کورد شەهید کرا و وەك زۆر کەسی تری بێکەس ئەویش لەبیرکرا. جا بۆ یادکردنەوە و وەفاداری بەرامبەر ئەم مرۆڤە بەهەڵوێستە مەزنە بڕیارماندا کاتژمێر ١٠:٣٠ ی سەرلەبەیانی رۆژی ٢٠٠٩/١٢/٢٩ لە نووسینگەی خۆی لە (سەرۆکایەتی وەبەرهێنانی کوردستان) لە شاری هەولێر دیدارێك لەگەڵ (هێرش)ی کوڕە گەورەی چیرۆکنووس ساز بدەین و لاپەڕە شاراوەکانی ئەم کەڵە نووسەرە شاکارنووسە هەڵبدەینەوە.

**دیدار: د. ئازاد حەمە شەریف**

*** مامۆستا دەکرێت کەمێك لە بارەی ژیانی تایبەتی و خێزانی مامۆستا "محەڕەم"مان بۆ باس بکەیت؟**

-برای بەڕێز كاك ئازاد لەگەڵ سوپاس و ستایشی بێ پایانم بۆ ئەرك و ماندووبوونتان لە پێناو ژیاندنەوەی كەلتووری دەوڵەمەندی ئەدەبییمان، بفەرموون وەڵامی پرسیارەكانتان بە ڕێزبەندی خۆتان.

باوكم لە ساڵی ١٩٢١ لە خێزانێكی ڕۆشنبیری سلێمانی لە دایك بووە، لە گەڕەكی "دەرگەزێن"، باوكی كە بە "حەمەی ئەمینەفەندی" بە ناوبانگ بوو كارمەندی حكومەتی بووە بە پلەی بەڕێوبەر ناحییە و دواتر قانیمقام لە زاخۆ و شەقڵاوە و ڕەواندوز كاری كردووە.

خاوەنی دوو برا و سێ خوشك بووە كە ئێستا كەسیان لە ژیاندا نەماون.

قوتابی كولێژی حقوق بوو لە بەغداد، بەڵام بەهۆی كاری سیاسی نەیتوانییوە تەواوی بكات و هەر ئەو هۆكارەش بۆتە هۆی ئەوەی درەنگ خێزان پێك بێنێ و لە ساڵی ١٩٥٩ دا ژنی هێناوە و سێ كوڕ و دوو كچی هەیە كە بەندە گەورەكەیانە.

لە ژیانیدا چەندین پۆستی حكومی بەسەربردووە كە لە بەڕێوبەری كتێبخانەی سلێمانی بووەتە كارمەندی مەلاریا و پۆستە جیاوازەكان لە شارەوانی سلێمانی و دواتریش بووە بە سەرۆكی شارەوانی. ژیانێكی پر مەینەتی و دەربەدەری بەسەربردووە و میوانێكی بەردەوامی بەندیخانەكانی عێراق بووە. لە "نوگرەسەلمان" و "فزیلیە"و "بعقوبە"و كەركووك و سلێمانی.

لە ساڵی ١٩٨٠ دوای ئەوەی ڕژێمی ئەوكاتە مەرجی خۆكاندیدكردنی بۆ ئەنجوومەنی نیشتیمانی ئەوكاتە و دواتر ئەنجوومەنی یاسادانانی ناوچەی ئۆتۆنۆمی بەسەر داسەپاندووە ئەمیش ڕەفزی بەردەوامی دەكرد، لە ئێوارەی ١٩٨٠/٧/٢٣ ئەمنی سلێمانی دای بەسەر ماڵەكەیدا و خۆی و هەموو كتێب و بیرەوەری و دەستنووسەكانی راپێچی زیندان كرد و دوای رۆژێك لێدان بەرگەی ئازاری نەگرت و لە ژێر لێداندا شەهید بوو. گۆڕەكەی لە "گردی سەیوان"ی سلێمانییە.

* كێ برادەرە هەرەنزیكەكانی بوون؟

- لە برادەرە هەرە نزیكەكانی ئەوەندەی لە بیری من بن، خوالێخۆشبوو حەمە ڕەشی خەیات، قالە برسی، هیوا سائب، مستەفا ساڵح كەریم، جیهان عومەر، ئەحمەد

هەردی، حەمە ساڵح دیلان، رەئوف مەعروف "مەکتەبەی گەلاوێژ". دوو کەس هەبوون کە زۆر خۆی بەقەرزاریان دەزانی وەك وەفایەك لە ژیانی سیاسیدا کە بەرێزان حەلاوە رەشی تەتەر و شەمسەخانی تەتەر بوون.

* ئایا مامۆستا پیاوێکی جدی یان سوعبەتچی بوو؟

- پیاوێکی هێمن و لەسەرخۆ بوو، هەرگیز تووڕەبوونی نەدەزانی، دڵپاك و بەوەفا بوو، حەزی لە قسەی خۆش و دانیشتنی قسەخۆشان بوو، چەند بڵێی ئەوەندە گەشبین بوو، لە تەنگژە و قەیرانە هەرە گەورەکاندا زەردەخەنە لەسەر لێوی لانەدەچوو.

* کێ لە نووسەرانی جیهانی و کوردی دەخوێندەوە؟

- ئەوەندی من ئاگادارم دیستویفسکی، ماکسیم گۆرگی، گۆگۆل، بەقولی دراسەی کتێبەکانی مارکس و لینینی دەکرد. یەکەم نووسەری کورد بوو کە "مەبدەئە بنەرەتیەکانی فەلسەفە"ی پۆلیتزەری بۆ خوێنەر و لاوانی ئەوکاتەی کورد وەرگێڕا، لە قوتابییانی قوتابخانەی مەتریالیزم بوو.

* بۆچ لە دوای تەمەنی پەنجا ساڵییەوە بەرهەمی چیرۆکی روویکردە کەمی؟

- لە دوای پەنجا ساڵ تەمەن بوو بە سکرتێری گۆڤاری "بەیان" و زیاتر بەرهەمەکانی لە"بەیان"دا بڵاودەکردەوە، لە هەوڵی کۆکردنەوەیان دا بوو، بەڵام ئاستی ئابووری خۆی بواری نەدا چاپی بکات.

* بە کام شۆڕشی دنیاوە و بە کام سەرکردەی دونیاوە دڵبەند بوو؟

- شۆڕشەکانی پرۆلیتاریا بە گشتی و سەرکردەکانی ئەو شۆڕشانە هەمیشە تەوەرەی بیرکردنەوە و لێکدانەوە و نووسینەکانی بوون.

* هەندێك لە وتە و قسە بەنرخ و گرنگەکانی چی بوون؟

- بە بەردەوامی بەرزی و پیرۆزیی وشەی "وەفا"ی لەسەر دەم بوو و ئەم سیفەتەی بە کلیلی رێکخستن و بەرەوپێشچوونی کۆمەڵگا دەزانی. وەفا بەرامبەر بە خێزان، هاوڕێ، گەرەك، شار، کۆمەڵگا، نەتەوە، فیکر، پۆست و بەرپرسیارێتی.

لەسەر ئەم بابەتە لە دوا قۆناغی ژیانیدا توێژینەوەیەکی ورد و قووڵی نوسیبوو کە باسی لە سەرکەوتن و نسکۆی وڵات و شارو خێزان و.... دەکرد و هۆکارەکەی دەگەڕاندەوە بۆ نەبوونی "وەفا".

باوکێکی زۆر ماندوونەناس بوو، هەمیشە هەوڵی پەروەردەکردنی مێشك و بیری نەوەکانی دەدا، هیلاك نەدەبوو کە بۆ چەند سەعاتێك لە دوای ڕۆژێکی دوورو درێژی کارکردن لەسەر یەك بابەت بۆمان بدوێ.

* هەڵوێستی بەرامبەر ژن چۆن بوو؟

- لە کۆتایی شەستەکاندا لەسەر وتارێك لە بارەی ژن و عەبا کە تیایدا داوای کردبوو کە ژنان پێویستە عەبا فڕێ بدەن و نموونەی بە ژنانی لادێ هێنابووە کە کاتێك لە کێڵگەکاندا شان بە شانی پیاوان کاردەکەن عەبایان بەسەرەوە نییە. ئەمە بوو بەهۆی ئەوەی لە "مزگەوتی گەورەی سلێمانی" ناوی لەگەڵ چەند هاوڕێیەکیدا هەڵبواسرێت بۆ کوشتن.

باوەڕی بە هەموو فیکرێکی ئازادیخوازانە هەبوو وەك لە هەموو چیرۆکەکانیدا ژن وەکو کاراکتەرێکی گرنگ و بەهێز دەرکەوتوون. ئەم بیروباوەڕەی لە ناوماڵ و خێزان و خزمان و دراوسێدا ڕەنگی دابووەوە.

* کام لە چیرۆکەکانی لەلا لە هەمووان گرنگتر بوو؟

- وەك من بیرم بێ زۆر پەیوەست بوو بە چیرۆکی "شای قەرەجەکان" و چیرۆکی "مام هۆمەر" کە تیایدا لە یەکەمدا کەسێکی نەتەوەیی دەورژاند و لەوی تریاندا چینایەتی.

==================================================

* ئەم دیدارە لە مانگنامەی (بەدرخان) ژمارە (١٣٢) لە ٢٠١٠/١/٨ بڵاوکراوەتەوە.

# چیرۆکی.... زیندووی مردوو له نێوان رەمزی هونەریی و شاری ئەفسوناویدا*

رەوف حەسەن

له بەشی دووەمی سالّی هەفتاکاندا دەستمدایە نووسینی زنجیرە وتارێك لەمەڕ یەکەمین چیرۆکی بلاّوکراوەی چیرۆکنووسەکانمان و.. هەر بەو ناونیشانە سەرەکییەش هەندێکیان بلاّوکرانەوە و بڕێکیشیان نەبلاّوکرانەوە و نەبەدەستیشم گەیشتنەوە.. لە نووسینگەی چاپەمەنی و بلاّوکراوەکانی ئەو سەردەمەدا بزربوون.. لەوانەی بزربوون و هێندەی لەبیرم ماون چیرۆکی (لەسەر کانییەك)ی د. کاوس قەفتان و (دارەکەی بەرماڵمان)ی ئەحمەد محەمەد ئیسماعیل و (لە ولاّتی قارەماناندا)ی بله و (نوشتەکەی نامینەخان)ی حەسەن قزلجی و (رۆنە زەنگی حەمەسەن)ی شاکر فەتاح و... تاد، بوون.. لەنێو ئەمانەشدا (زیندووی مردوو)ەکەی محەرەم محەمەد ئەمینیش بوو بە نێونیشانی (زیندووی مردوو لە نێوان رەمزی هونەریی و شاری ئەفسووناوی)دا.. کە لە کۆتایی سالّی ١٩٥٣ دا لە ژمارەکانی ١١٧٤ تا ١١٨٩ی رۆژنامەی ژیندا بلاّویکردەوە.

ئەوەی راستیبێت چ ئەوانەی بلاّوکرانەوە و چ ئەوانەشی بلاّونەکرانەوە.. چیرۆك و هەوڵدانی ئاستبەرز و نزمیان تێدابوو.. وەلێ ئەوەی بەلای منەوە گرینگ بوو ئەو چیرۆکنووسانە گشتیان لە سالاّنی داهاتووی دوای ئەو هەوڵە یەکەمینە (نۆبەرەیە)یان

* رەوف حەسەن – ئەندێشە جوانەکانی رۆح لە چیرۆکی کوردی دا ..- لە بەشی (لەگەلّ یەکەمین نۆبەرەی بلاّوکراوەی چیرۆکنووسەکانماندا ) هەولێر ٢٠٠٥ ، ل ل ٢١٨-٢٢٨.

له نێوەندی چیرۆکی کوردیماندا لە داهێنانی هونەریدا و پێشخستنی ئەم تەرزە هونەرەماندا بوونە ناوی درەوشاوە و خاوەن شەقڵ و جێپەنجەی دیاریان بەسەر چیرۆکی کوردییەوە.. تەنانەت گەلێکیان هەر لە یەکەمین چیرۆکیانەوە وایان لێکردین هەست بە سەلیقە و لێوەشاوەیی و ورد و هونەرییان بکەین.. وەك (پەنجا فلس)ەکەی (مەم) و (چای شیرین) ەکەی حوسێن عارف و (نوشتەکەی نامینەخان)ی قزلجی و (فرمێسکی پەشیمانی)ی مستەفا ساڵح کەریم و.. هەروەهاش (زیندووی مردوو) ی محەرەم محەمەد ئەمینیش.. کە بەڕاستی تایبەتمەندیەکی هونەریی باڵای پێوە دیارە و.. هەر دە دوانزە چیرۆکەکانی دیکەیشی لەم نوقڵانەیەی (زیندووی مردوو)ەوە سەریانهەڵداوە.. لەو زمانە رەوان و هونەرییەی چیرۆکنووسێتیەوە.. لەو سیحرە پەنهانەی نێوان و کۆتایی نەهاتنی چیرۆکەکان کە هەستدەکەیت وەك هەندێ چیرۆکنووسی دەستەوسان بەدیار کەسێتییەکانیەوە دۆش دانامێنێت و.. دوای ئەوەی زەربەی کۆتایی دەماغاتە جیهانێکی پڕ لە هەژان و بیرکردنەوە و شیکردنەوەی رەمز و چیفرە و ئاماژەکان و.. دەشێت دەیان خوێندنەوەی جۆراوجۆر بۆ ئەم چیرۆکە و (شای قەرەجەکان) و (پەتیارە) و (سەیرانێك لە نەزمڕ) و (بۆخۆیی) و ... هتد بکرێت.

**شارێکی ئەفسووناوی**

شارێکی بێ ناو.. کۆڵان و بازاڕ و مزگەوت و ماڵ پڕ لە مردووی چوون لیژنەدار هەڵچنراو.. جێ نەماوە پێی لێدانییێت و خەڵکیش بەسەریاندا هەر هاتووچۆیانە.. بۆگەن پیاو کاسەدکات و کەچی هەستی پێناکەن.. نەتازێیان بۆ دادەنێن و نەدەشیاننێژن.. ئەگەر کەسێکی نامۆ رێی بکەوێتە ئەو شارە و رەخنە یان پرسیاری ئەو رەوشە قێزەوەندەیان لێبکات.. یان شپرزە و سەرسامبێت.. ئەوا دەیکەن بەکێوا و پێدەچێت پارچە پارچەیشی بکەن.

**کەسێتییەکان**

سەرەتا دوو کەسێتی هەن.. یەکەم (راوی) چیرۆکەکە.. کە دەشێ هەر نووسەر خۆیشی بێت کە کەسێتی دووەم دێنێتە ئاخاوتن.. دووەمیش: دەروێشێکە کەڵەگەت،

لاواز، پرچ و ریش سپی و درێژ، کەشکۆڵ و کەوڵ و پۆست بەکۆڵ، دار عەسا بەدەست و پاش کەمێك ئەمیش دەبێتە ڕاوی بەسەرهاتێك و هەمدیسان خۆی دەبێتە کەسێتی سەرەکی بەسەرهاتەکە و.. ڕاوی یەکەم (چیرۆکنووس) تا نزیك کۆتایی گێڕانەوەی سەرگورشتەکە دەبێتە گوێگر یان وەك خوێنەرێکی لێدێت کە چەندین پرسیاری لا کۆدەبێتەوە و.. بۆ ڕوونکردنەوەی نهێنییەکان.

لەنێو سەرگورشتەکەدا چەند کەسێتی دی جگە لە دەروێش دێنە ئاراوە.. وەك فەقێ و مەلای مزگەوت و خەڵکی شارە ئەفسووناوییەکە.

**پوختەی چیرۆکەکە**

کە دەروێش ڕێی دەکەوێتە شارە سەیر و سەمەرەکە.. دڵی دەگیرێ و بەدووای هۆکاری ئەو ڕەوشەدا وێڵ دەبێت.. تا لە مزگەوتێکدا لە فەقێیەکە دەپرسێت.. فەقێ لە پرسیارەکەی دەحەپەسێ و پێیدەڵێت ئەوانە نە مردوون و نە بۆگەنیانکردووە و هەمووشیان کەس و کار و خۆشەویستمانن ئیدی چۆن بیاننێژین!.. جێیدێڵێت و مەلا بەمە دەزانێت و دەیەوێت ئاگاداری بکاتەوە تا بەپەلە لە شارەکەیان دەرچێت.. چونکە دەروێش بەو پرسیار و ڕەفتارەی گوڵتاوەڕۆییەکی وای ناوەتەوە هاکا خەڵکی شار هاتن و پارچە پارچەیانکرد.. پاش قەیرێك دەروێش کە خەڵکی شارە نەفرەتییەکە دەبینێت مشتومڕیانە و خەریکن بۆی بێن.. هەڵدێ و خۆی قوتار دەکات.

**هونەرکاریی**

١ـ وردەکاریی لە شێوازی گێڕانەوەدا:

محەرەم لەم چیرۆکە و گشت چیرۆکەکانی دیکەیدا شێوازی گێڕانەوەی (سەرد)ی هونەریی بەکارهێناوە و دەزانێ چۆن خوێنەر کەمەندکێشی چیرۆکەکەی دەکات و.. وایلێدەکات تا دوایی دەستبەرداری خوێندنەوەی نەبێت.

بە بۆچوونی خۆم ئەو شێوازە هونەرییە یەکەمین بنەمای چیرۆك و ڕۆمان و شانۆنامەیشە و.. سەرچاوەکەیشی لە داستان و ئەفسانەکانەوە وەرگرتووە.. ئەو چیرۆکەی نەتتوانی بیخوێنیتەوە.. کەمەندکێشی نەکردیت تووڕیدە.

به پلەی دووەمیش ئەوەیە تا چەند شوێنەواری درێژخایەنی خۆی لە زەین (میمۆری)ی خوێنەردا جێدێلێت.

(مردووی زیندوو) هەردوو رەگەزە سەرەکییەکەی ئەم هونەر و دەسترەنگیینەی بە تین و تاوێکی قووڵەوە تێدایە و.. لەتەك (شای قەرەجەکان) و (سەیرانێك لە ئەزمڕ) لە خانەی شاکارەکانی چیرۆکی کوردیماندا ریز دەکرێن.

لە (مردووی زیندوو)دا.. هەر لە دامەزراندنی سەرەتای چیرۆکەکەوە چیرۆکنووس بۆشاییەکی بێ تیشی بۆ گێڕەرەوە دروستکردووە. نازانی چی بکات.. ئەمە زەمینە خۆشکردنێکە بۆ تەرخانکردنی کاتی تەواو بۆ گێڕانەوە و گوێگرتن و خوێندنەوەی بەسەرهاتەکان.. ئیدی کە (دەروێش)یش بە تڕوتفاقەکانیەوە پەیدا دەبێت.. دەرووی رەحمەت لە (راوی) دەکرێتەوە و.. لەتەك راویدا تا کۆتایی بە سەرسوڕمان و پەرۆشەوە وەدووای سەرگوزەشتەکەی دەکەوین.

**٢ـ سیحر:**

ئەو چیرۆکە یان ئەو کارە هونەرییەی ئەمرە.. ئەوە هەڵگری سیحرێکە.. بەبێ ئەو سیحرە دەبێتە شتێکی ئاسایی رۆژانە.. تۆ رۆژانە لەسەر شەقام و نێو شوێنە گشتێکاندا هەزاران کەس دەبینێت و دوای گەڕانەوەت بۆ ماڵەوە هیچیان لە زەینتدا نەماون.. لێ ئەگەر خۆشەویستەکەتت لە تەکسییێکدا بۆ چرکەساتێ بەلاتدا رەتبوو.. ئەوە نە هەر لە زەینتدا دەمێنێتەوە.. بگرە دڵەخورپێت پێدەکەوێت و شپرزەیش دەبێت.. ئەی ئەگەر لاشەی چوون لیژنەدار هەڵچنراو لەسەر رێگەوبانەکانی شاردا ببینیت!! ئەگەر بۆگەنیان پیاو وڕ و کاس بکات!! ئەی ئەگەر لەو شارەدا بەتەنێ تۆ ئەمە ببینیت و سەرجەمی خەڵکی هەستی پێنەکەن.. یاخود بەلایانەوە ئاسایی بێت چۆن دەهری نابێت!! چۆن وەدووای ئەم نهێنییە ناکەوێت؟! گەورەترین سیحری ئەم چیرۆکە وا لەنێو ئەو شارە ئەفسووناوییە ـ راستینەییە ـ و چۆنێتی بیناتنانە هونەرییەکەیدایە.

٣ـ قەناعەتپێکردنی دوور لە دەستکرد و هەڵبەستراو:

دوای ئەوەی دەروێش دەڵێت: خەڵکی هەموو جێگەیەکم.. ئەی نازانی دەروێش وەکو مار هەرساتە لە جێگەیەکدایە (٤٧ ـ ١).. ئیدی هەست بەوە ناکەیت چیرۆکنووس زۆرکاریی کردبێت.. بەڵکو لە دیالۆگی دوای ئەمەی راویدا قەناعەت بەرەوانیی رێچکەی چیرۆکەکە دەکەیت کە دەڵێت:

ـ مامە! مەسەلەیەك هەیە ئەڵێ مرۆڤ تا بگەڕێ شتی سەیر ئەبینێ.. تۆیش لە زۆر گەڕانتا ئەبێ شتی سەیرت دیبێ (٤٨ ـ ١).

ئەم دیالۆگە دەبێتە کلیلی سیحریی بۆ خستنە سەر گازی پشتی دەروازەی چیرۆکەکە.. بروانە بەر لەوەی دەروێش سەرگوزەشتەکەی بگێڕێتەوە.. چیرۆکنووس چ ئاماژەییەکی زیرەکانەمان دەداتێ کاتێ دەڵێت:

دەروێش (سەرنجی دایە شەقامەکە کە لە پەنجەرەکەوە دیاربوو ئینجا وتی (٤٩ ـ ١).

هەر لەو ڕووەوە.. کاتێ دەروێش لە سەرگوزشتەی دەبێتەوە کەسێتی یەکەم خەندە دەیگرێت و ئەویش دەزانێ کە ئەم گاڵتەی بە بەسەرهاتەکە دێت دەڵێت:

ـ ئەی لەپێشدا پێم نەوتی دەروێشێکی وەکو من خۆی چییە و سەرگورشتەی چییە (٦١ ـ ١).

دەروێش ئەم قسەیەی لەوپەڕی قەناعەت بەخۆ و پتەویی مەبەستەکانییەوەیەتی.. بەسەرزاری وادەردەکەوێت دەروێش خۆی و ژیان و بۆچوونەکانی زۆر بەسادە و ساویلکەیی دادەنێت.. وەلێ بڕوابەخۆبوونێکی لەرادەبەدەری تێدایە و.. وەك ئەوە وایە پێیوتبێت:

ـ براله! رەنجبەخەسار خۆم.. نەدەبوو قسە بۆ گەوجێکی وەك تۆ بکەم..

ئیدی راوی دەیەوێت پاساوی زەردەخەنەی بەوە بداتەوە کە گوایە دەروێش کابرایەکی زۆرزانە و.. ئەم لەوە سەرسامە (کوێرا بەخەیاڵ ئەم چیرۆکەی دروستکرد!!.. ئەگینا شاری وا کوا هەیە... چونکە مردوو ناشتن لە زەمانی هابیل و قابیلەوە زانراوە).(٦١ ـ ١).

**٤ـ دانانی ڕەمز و جیفرەکان و.. بەخشینی هەندێ کلیل بۆ کردنەوەیان:**

تا ئەو کاتەی محەرەم محەمەد ئـەمین ئـەم چـیرۆکە هێمـادارەی نووسـی لـە بـواری چیرۆکی کوردیدا هیچ چیرۆکێکی هێما ئامێز نەنوسرابوو هێندەی ئەم چـیرۆکە لایەنـە هونەرییەکەی بەهێز و تۆکمە بێت.. عومەر مارف بەرزنجی لەم ڕووەوە دەڵێت:

(ئەگەر لە سەرەتای سالانی پەنجاکاندا چیرۆکێکی ڕەمزیی بـەهێز نووسـرابێت ئـەم چیرۆکەیە و شێوازێکی فەلسەفیشی وەرگرتووە).(٢)

بەڵێ.. هێما و ڕەمزەکانی نێـو ئـەو شـارە ئەفـسووناوییـە ـ ڕاسـتینەیە ـ گـەلێ دەلالاتی فەلسەفیش دەگرنە خۆیان و .. پێدەچێت شیکردنەوەی جیفرە و هێماکان لـەم حاڵەتەدا وەك شیکردنەوەی ڕەمز و هێما مێژووییەکان ئاسان نەبێت.. حوسێن عـارف لەم بارەیەوە دەڵێت:

(خوێنەر تەنها تەوژمی حالیحازری مەعلوومات وەردەگرێت و.. مێژووەکە لەکایەدا نییە تا یاریدەی بدات.. چونکە ڕەمزەکان دروستکراوی خەیاڵی نووسەرن)(٣).

بۆیی چیرۆکنوس لە بەشی دوایی چیرۆکەکەیدا و هەر بە ئانقەسـت هەنـدێ کلیـل (پاسۆرد)ی بە خوێنەر بەخشیوە.. چونکە لەو سەرویەندەی نیو چەرخ لەمەوبەردا ئـەم کارە بۆ خوێنەرە هەرزەکارەکان زۆر پێویست بوو.. ئەوەتا دەروێش یەکـسەر لـە بنـی هەمانەکە دەدات و.. بە (ڕاوی) دەڵێت:

ـ تۆ خۆت ئێستە ڕا لەو شارەدا دەژیت.. کەچی چاوت کوێربووە.. ئـەم مردووانـە نابینی.. لووتیشت گیراوە بۆنی بۆگەن ناکەیت، ئا سەیرێکی دەرەوە بکە! (٦٢ ـ ١).

دواتر کە هەر بڕوا ناکات دەڵێت:

(ئایا ئەمانە مردوو نین و گلۆرکراونەتەوە!) (٦٦ ـ ١).

**٥ـ جیاوازیی و دژواری لەگەڵ.. بۆچوونی باوی نێو کۆمەڵدا:**

ئەگەر سەرنجێکی وردی شیعر و چیرۆك و ئـەدەب و رۆشـنبیریی کـوردی بەگـشتی بدەین.. ئەوە بەزەقی دەبینین سـووکایەتییەکی لەرادەبـەدەر بـە پـرچ و دەف و زرك و کەوڵ و پۆست و بیروبۆچوونی دەروێش و شـێخ و مـەلا.. تـاد کـراوە.. ئـەم کـارەیش

بەڵگــە و نیـــشانەی مــۆدێرنێتی و پێــشکەوتنخوازێتی نووســەرانی ئەوســا تەنانــەت ئێستەیشە.. کەچی محەرەم لە روانگــە و دیـد و بۆچـوونێکی پێـچەوانەوە و وەك ئـەو مەلەوانە سـەرسەختەی بییەوێت بەپێـچەوانەی تـەوژمی رووبارەکـەوە مەلـە بکـات.. دەروێشێك بە هەموو تفاقەکانیەوە دەکاتە پاڵەوانی سەرەکی ئەم چیرۆکەی و... چـوون کەسایەتییەکی دانا رەخنە نـە هـەر لـە مزگـەوت و فـەقێ و مـەلا دەگرێـت بـەڵکو سەرتاپای کۆمەڵ و نەریت دەخاتە ژێر هەڵسەنگاندنێکی ورد و توندوتیژیشەوە و هـەر هەموویان چوون ئاژەڵ سەیر دەکات.. بێگومان دەروێش لەمەدا مەبەستی ئـەوە نییـە خەڵکەکە دەبێت خەریکی نوێژ و خواپەرسـتی بـن.. چـونکە ئـەوەیان لـە شـارەکەدا بەرکەماڵە.. بـەڵکو بەئاشـکرا داوای راپـەرین و هـەوڵ و تێکۆشـان و گـۆڕینی ئـەو بارودۆخە چەقبەسـتوو و مردارەوەبووە دەکات بەرەو پێـشکەوتن و گەڕانـەوەی هەسـتە مرۆڤایەتیەکان بۆ هەستکردن بەهەقیقەتی ژیان.

**٦ـ (دانەبڕان): یان پێوەندی سەرگوزشتەکە.. بە کەسێتی یەکەمەوە:**

دەبێت ئەوەشمان لەیاد نەچێت. چیرۆکنووس لە کەسێتی یەکەمدا گشت روخـسار و سـیماکانی ئـەو خـەڵکی ئـەو شـارە ئەفـسووناوییەی کۆکردۆتـەوە.. کەسـایەتییەکە سەرتاپای بێ ئیشی و... نازانێ چی لەو کاتەی ژیـانی بکـات.. چایخانە و دۆمینـە و تاوڵە و دەمەتەقێ و کات هەر ناڕوات.. تەنانەت هیچی بۆ نەماوەتەوە یاری بە زیخ و لمەکەی نێو وەجاخەکەش دەکات.. کە ئەمە ئەوپەڕی بێهوودەیی ژیانـە وەدەروێشیـشی هەر بۆ ئەوە لا بەنرخە تاکو بۆ بەسـەربردن و بەفیڕۆدانی کاتەکەی حکایەتی بۆ بکات و دەڵێ:

(خوا دەرووییەکی لێکردمەوە.. نەك هەر ئەو دوو سـەعاتە بـەڵکو سـێ سـەعاتی کەیشی چووە سەر) (٤٥ ـ ١).

لێرەدا قسەیێکی (کرۆبسکایا)م وە بیردێتەوە کـە لـەکتێبی (التثقیف الذاتي) دا دەڵێت: (تا سۆڤییێت وەك ئەمەریکا رێزی کات نەگرێت هیچ بە هیچ ناکەین).

کات.. چرکە بەچرکەی ژیان و تەمەن.. ئەو گەوهەرە بێوێنەیەیە هەوڵدەدەین چۆن بەفیرۆی بدەین.. جا لەبەر ئەوەی لەم چیرۆکەدا راوی، دەروێشی بۆ ئەوە دەوێت کاتەکەی پێبەسەر بەرێت، لێ دەروێش هەر زوو هەست بەوە دەکات و.. پێدەچێت لەنێو هەزاران بەسەرهات و سەرگورشتەدا بیری کردبێتەوە تا ئەمەیانی هەڵبژاردبێت.. ئەویش بە پلەی یەکەم لەبەر پێوەندییە پتەوەکەیەتی بەکەسێتی بێکەمەوە و.. ئەوجا بەسەرجەمی خەڵکی ئەو شارەیشەوە.. هەر بۆ ئەوەشە کە توندوتیژترین تانە و تەشەر بگرێتە ئەو خەڵکە بێ هەست و نەست و لەش داهێزراو و بێ موبالاتەی بە ژیانی ژێردەستەیی و ملکەچی قایلن و بیر لە گۆڕان و راپەرین و ئازادی ناکەنەوە و.. لە وەڵامی زەردەخەنە قەشمەرییەکەیدا دەڵێت:

- بزووتنەوەی بێ ئامانج بەهیچ کلۆجێك مانای ژیان نابەخشێت (٦٦ - ١).

چیرۆکەکە بەوە کۆتاییێت کە وشەکانی دەروێش کەم تا زۆر کاریگەرییان بەسەر کەسی یەکەمەوە دەمێنێتەوە و.. دوا قسەی دەروێش لەگوێیدا دزرنگێتەوە! ئەی "ئەوانە مردوو نین.. گلۆر کراونەتەوە! (٦٧ - ١).

==================================================

**پەراوێز و سەرچاوەکان:**


١- محەرەم محەمەد ئەمین، گۆمی شڵەقاو، بەغدا، چاپخانەی ئەسعەد، ١٩٥٧.

٢- عومەر مارف بەرزنجی، پێرەوگەکانی چیرۆکی کوردی و... گۆڤاری (رۆشنبیری نوێ) ژمارە ٧٠ ساڵی ١٩٧٨.

٣- حوسێن عارف، شێوازەکانی تەکنیك لە چیرۆکی ساڵەکانی دوای ١٩٧٠ دا، رۆشنبیری نوێ، ژمارە ٧٣، ساڵی ١٩٧٧.

# محەرەم محەممەد ئەمین وەك سەرەتایەك بۆ هونەری رۆمانووسین

**محەمەد رەنجاو**

دەکرێ کە قسە لەبارەی رۆمان و سەرەتاکانی سەرهەڵدانی رۆمان بکرێ، وەك ئەو دنیابینییە لێکبدرێتەوە کە قسە لەبارەی شارستانیەت و سەرەتاکانی هەنگاونان بەرەو شارستانیەت دەکرێ، چونکە سەرەتاکانی رۆمان زادەی هەمان ئەو سەرەتا شارستانییانەن کە مرۆڤایەتی هەنگاوی تێدا هەڵێناوە. سەرەتای پەنجاکان، سەرەتای خەملینی ئەو گۆڕانکاریانە بوون لە کوردستان دا کە لە دەرەنجامە رونەکانی جەنگی جیهانی دووەمەوە کەوتبوونەوە، ئەو جەنگەی دنیای بە ئاقارێکی دیکەدا برد کە تەواو جیاواز بوو لەو ئاقارەی دنیا پێشتر لە سەری راهاتبوو؛ جەنگ و دەرەنجامەکانی ئەو جەنگە، شێوازەکانی جیهانگیری بەسەر کۆمەڵگای ئەوسادا پەرت کردبوو، گەلی کوردیش لەم دۆخە جیهانگیرییەی جەنگ بێبەری نەبوو، ئەو ئاوێزە بوونە سەربازی و رووناکبیری و ئابوورییەی جەنگ دروستی کردبوون، سیماکانی خۆی بەسەر خەڵکی کوردستانیشدا پەرت کردبوو، ئەم دۆخە نوێیەش نەدەکرا بێ گۆڕانکاری لە بیرکردنەوە و نوێبوونەوە لە ئاستی ئەو بیرکردنەوە کوردییە راگوزەر بکات، چونکە لە هەموو سەردەمەکاندا، سیمای هەرە دیاری کورد و مانەوەی ئەو بوونە کوردییەش بە خۆگونجاندن لەگەڵ گۆڕانکاریەکاندا پەیوەست بوو، رووی گەشی هەموو رابردووی کورد ، رووی پێشوازیکردن لە گۆڕانکاریەکان بووە، قبوولکردنی پێشهاتە تازەکان و ئەو گەلە بوونی خۆی و بەردەوام بوونی ئەو بوونەی لە گۆڕانکاریەکان بینیوەتەوە، هێراقلیتسی یۆنانیش، دەمێکە گوتوویەتی: (( گۆڕانکاریەکان سیمای بنچینەیی هەر بوونێکن)).

ئەم گۆڕانكاریە گەوهەریانەی لەم جەنگە كەوتنەوە، سەرەتاكانی چیرۆكی درێـژی كوردی وەك بنەمایەك بۆ ڕۆمانی كوردی لێ بەرهەم هات و ئەو مرۆڤەش كە ئەمڕۆ بە ڕێزەوە یادی دەكرێتەوە ، كاراكتەری سەرەكیی ئـەم هـەنگاوە مەعریفییـە بـوو، كـە دابڕانێكی جەوهەری لە بەرهەمە داهێنراوە ڕووناكبیریەكانی پێش قۆناغی خۆی كرد.

محەرەم محەمەد ئەمین بەرهەمی سەردەمێكی ئالۆز و یەكلاكەرەوە بوو، سەردەمێك كە لە شوناسێك دەگەڕا بۆ ناونانی خۆی، لەوە ناچێ ئەو بـە پێخواسـی هاتبێتـە نـاو گەمەكەوە، گەمەی نووسین و ئافراندن و دابڕان لـە سـەردەمەكانی پـێش خـۆی، ئـەو شـارەزای سـەردەمەكەی خـۆی بـوو، پرسـیارەكانی ئـەو سەردەمەشـی ورووژانـدوە، سـەردەمێك كـە شـار وەك پێگەیـەكی جـوگرافی و گردبوونەوەیـەكی كۆمەڵایـەتی پێداویستی ژیاریانەی خۆی ڕاگەیاندووە.

جەنگی جیهانی دووەم و ئەو ڕووداوانەی لـەو جەنگـە كەوتنـەوە، كاردانەوەیـەكی دیاری لەسەر پێگەی كۆمەڵایەتی ڕۆژهەڵات دانـا و كوردسـتانیش لـەم گۆڕانكاریانـە تەریك نەبوو، ئەو گۆڕانكارییـە كۆمەڵاتیانـەش كـە لـەناو پێكهاتـەی بونیـادی ئـەو كۆمەڵگایەوە هاتبوونە دی كە دەكرێ لێرەدا بە ژێرخانی كۆمەڵایەتی قسەی لـەبارەوە بكەین، پێویستی بە جۆرێك لـە جۆرەكـانی سـەرخان هـەبوو بـۆ تـەعبیر كـردن لـەو گۆڕانكاریەی ژێرخـانی كۆمـەڵگا، ئـەو سـەرخانەش، ئـەو جوولـە فیكریـە بـوو كـە پێشەنگییەكانی ئەو قۆناغە ئیشیان لەبارەوە دەكرد و محەرەم محەمەد ئەمین لە چیرۆكدا وەك پێشەنگ خۆی خـستە ڕوو، گەشـەی هـەرە دیـاری كۆمەڵایـەتی لـەم قۆناغـەدا، گەشەی ژیانی شار و گۆڕانكاریی ئەم قۆناغە بوو لە پێكهاتەی كۆمەڵگای گوندی.

نۆڤلێتی ((مام هۆمەر)) لە ساڵی ١٩٥٤ دا لە هەولێر لە چاپخانەی كوردسـتان و لەسەر ئەركی محەمەد مەمەندی ددانساز چاپی كردووە، كە دەكرێ مێژووی نووسـینی نۆڤلێتەكە بۆ بەر لەو مێژووە بگێڕینەوە.

نۆڤلێتی ((مام هۆمەر)) كە خۆی بە چیرۆكی درێژ وەسفی كردووە بە دوو ئاراستەدا گرنگی خۆی پەرت دەكا. ئەم نۆڤلێتە، هەموو بنەماكانی پێكهاتەی ڕۆمانی بـەخۆوە

گرتووە، هەر لـە بـەرینی رووداوەوە کـە دەکـرێ زۆر پـەل و پـۆی لێ بکرێتـەوە، تـا چڕکردنەوەی زەمەن و قـووڵی ناوەرۆکـە فەلـسـەفیەکە، کـە ئەمـەیان زیـاتر جێگـەی بایەخی منە بەو بەرهەمەی محەڕەم محەمەد ئەمین. ئاڕاسـتەی دووەم کـە گرنگـی ئـەم شاکارە ڕوون دەکاتەوە، مەسەلەی قـەکردنە لـەبارەی شـار، دەرچـوونە لـەو جـوغزە بەرتەسکەی کێشەکانی گوند و ڕوداوەکانی پەیوەست بە زەوی و چاندن.

مام هۆمەر، لە شار دەژی و ئەمە گۆڕانکاریـیەکـە لـە پێکـەی جـوگرافی ژیـانی خۆی، چۆن گۆڕانکاریەکیشە لە پیشەیەکی تازەی مـام هۆمـەر کـە دەکـرێ لێـرە بـە کێشەی چرکەسات ناوزەدی بکـەین، ئەگـەر مـام هۆمـەر لـە گونـد بوایـە، هـەرگیز ڕایەڵەیەك بۆ ئەم ڕووداوانەی نۆڤلێتەکە بەرهەم نەدەهات، چونکە لە گونـدا کێـشەی چرکەسات بەدی ناکەیت. زەمەن لە گونددا، زەمـەنێکی جیوەییـە، بـەڵام لـە شـاردا زەمـەنێکی چرکەییە. گوندی هاوینان بەردەوام کار دەکەن، بۆ ئەوەی زسـتان بـەردەوام کار نەکەن و بخۆن. شاری ڕۆژانە کار دەکا، بۆ ئـەوەی شـەوانە بـە ئاسـوودەیی تێـری بخەوێ و تووشی گرفتی لەو جۆرە نەبێ کە مام هۆمەر بە هۆی لەدەستدانی کاری ئـەو ڕۆژەی، شەو تووشی کارەساتی وا ببێت.

مام هۆمەر حەماڵێکە، ڕۆژانە تێکـەڵی بـازار و بازرگانـەکان دەبـێ. بـەو ڕەنجـە منداڵەکانی بەخێو دەکا. ئەو هەموو ژیان لە کۆپانەکەی پشتیەوە بەدی دەکا و ئەوەی ئەو ڕۆژە پەیدای نەکات، شەو نییەتی بیخوات، ئەو شـەوە وادەکـات ئـەو ڕۆژەی کـە نەیتوانی کارێکی دەست کەوێ و شتێك پەیدا بکات بۆ ئەوەی بیدا بە کـۆلێرە و چـای ئێوارە، سـەرجەم ژیانی بە ئاراستەیێکی تراژیدیدا کەوتەوە و خۆی کەوتە بەندینخانـەوە و (خەجێ) ی ژنیـشی وەك سـۆزانییەك کەوتەوە. مام هۆمـەر ئـەو ڕۆژەی نـەیتوانیبوو پارەی دەست بکەوێ، ئێوارەکەی منداڵەکانی بێ شێو بـوون، و لـە برسـانا هەراسـان ببوون، لە ماڵی بایز بەگی دراوسێشیان ((ئاهەنگ بوو، ، باخچەکەیان بە گوڵی سەوز و سوور ڕازابۆوە، قاپی چێشت و پێکی مەی لەسەر مێز ڕیز کرابوون.)) ئا لەو کاتەدا مام هۆمەر پێ لە جەرگی خۆی دەنێ بـۆ دزینـی دەورییـەك چێـشت بـۆ منالـەکانی

دەچێتە موبەقەکەی ماڵی بایز بەگ، بەڵام دەگیرێ و حەواڵەی پۆلیسخانە و دادگا دەکرێ و بە سێ مانگ بەندی سزا دەدرێت، لە ماوەی ئەو سێ مانگەشدا ، ژنەکەی لە پێناوی بژێوی منداڵەکانی دا ، دەست لەگەڵ پیاوان تێکەڵ دەکا و وەك سۆزانییەك ڕۆژانەی خۆی دەباتە سەر.

دوای سێ مانگەکە و بەربوونی مام هۆمەر، هەر لەیەکەم شەودا ، کاتێ یەکێك لە پیاوانی سێکسی دەچێتە ماڵیان، بێ ئاگا لەوەی خەجێ مێردی هەیە، دوای سێ مانگ زیندانی، ئەم ڕۆژە ئازاد بووە و لە ماڵەوەیە، لە تێك هەڵخشانێکا ، مام هۆمەر دەکوژرێ و ژنەش بەسەر لاشەی ئەودا خۆکوژی دەکا.

هەڵبژاردنی بابەتێکی ئاوا لەو سەردەمەدا، گۆڕانکارییەکی دیارە لە دید و بۆچوونەکاندا، ئەمانە هەموو کەرەستەیەکی بە پێزی ڕۆماننووسینن، هەر ئەوەشە وا دەکا ئێمە محەڕەم محەمەد ئەمین وەك سەرەتایەك بۆ هەوڵەکانی ڕۆمان نووسین لە ئەدەبی کوردیدا پێناسە بکەین.

لەوە دەچێ چیرۆکنووس، هۆشمەندییەکی باشی لەبارەی ئەدەبی جیهانی و ڕۆمانی جیهانی هەبووبێ بە تایبەتی دیستۆیڤسکی، چونکە هەموو هەڵبژاردنەکانی ئەو بۆ ڕووداو و ڕایەڵ و چنینەکانی ڕووداوەکان، بە وریاییەکی زۆرەوە مامەڵەی لەگەڵدا کراوە، بەتایبەت ڕۆحە فەلسەفییەکەی. تۆ تەماشاکە هەڵبژاردنی کارەکتەرێك، کار دەکا، کاری دەست ناکەوێ، منداڵەکانی برسین نانیان دەست ناکەوێ، دزی کردن لە پێناوی ئەمردنی مرۆڤ دا، ئەمانە هەموو، کەشوهەوایەکی دیستۆیڤسکیانەی بەسەردا زاڵە و ڕۆحێکی فەلسەفیانەش باکگراوندی هێڵە فیکرییەکانی ئەم نۆڤلێتەن. دیستۆیڤسکی هەموو هێڵە فیکرییەکانی، ئایدیاکانی و لە دواییشدا دیدی ئەو بۆ ژیان لە یەك ڕستەدا کۆدەبێتەوە کە دەڵێ: (ئەگەر خوانەبێ، هەموو شتێك جایزە.)) دەشێ لای دیستۆیڤسکی (خودا) زیاتر بەهایەکی فیکری و ئەخلاقی تێدا بەرجەستە بووبێ .تا سیمبۆلێکی میسالیانە، بەڵام دەشێ ئەم دیدە فەلسەفیەی دیستۆیڤسکی، کاردانەوەیەکی زۆری بەسەر محەڕەم محەمەد ئەمین- دا جێهێشتبێ، چونکە ناکرێ

ئاگای لە دنیا و جیهانبینی و لە دوایشدا شاکارەکانی دیستۆیڤسکی نەبووبێ و ئەو کەشە درامییە دیستۆیڤسکیەی بە بەرهەمەکانیەوە دیارە، هەڵگری ئەم ڕاستیەن و لە نۆڤلێتی مام هۆمەر دا، ئەم کەشە زۆر بە زەقی دەبینرێ، بەتایبەتی لەو دیدە گومانادوییە بەرامبەر هەق و ناهەق دەری دەبڕێ .

مام هۆمەر منداڵەکانی بە برسیەتی دەبینێ، هەست دەکا، ئەوان بێ شێو سەر دەنێنەوە و لەودیو ماڵەکەی ئەوانیشەوە بایز بەگ لە عەیش و نۆشی بادە و خواردنی باش دان. ئەو دەزانێ دزی کردن هەر دزی کردنە هەرچەند جۆرە پاساوێك دوای ڕووداوی دزییەکە لە دادگا دەخاتە ڕوو بەوەی کە ئەو سەروەت و سامانانەی بایز بەگ بەری ڕەنجی چەندان زەحمەتکێشی وەك ئەوە، کە ئەم تەحەکومی تێدا دەکا ، بەڵام ئەمە تەنیا پاساوێکی بەردەم دادگایە، ئایدیای ڕوونی ڕۆمانەکە ئایدیای (ئەگەر خوا نەبێ، هەموو شتێ جایزە)کەی دیستۆیڤسکیە.

بۆ ئەوەی منداڵەکانی لە برسان نەمرن، دەبێ شتێك بکا، هەموو شتێکیش لە پێناوی ڕزگارکردنی منداڵەکانی لە مردن و برسیەتی ڕەوایە و هەر ئەو دیدە فەلسەفیەشە، کە ئاراستەکەری کاراکتەری سەرەکی نۆڤلێتەکەیە بۆ دزی کردنی دەوریەك چێشت.

ڕووداوەکانی کورتە چیرۆکی مام هۆمەر، سەرجەم لە کەش و هەوایەکی درامی خەست دا دێن و دەچن و میکانیزمی ئەو وەگەڕخستنە درامیەش، ئەو ئاراستە فیکریە تەحەکومی تێدا دەکات، کە جۆرە ڕەواییەك دەدا بەو دزی کردنە و ئەو دیدە فەلسەفیەی دیستۆیڤکسکیش، هەمیشە ئامادەیە لە هێڵە فیکرییەکەی مام هۆمەردا.

مام هۆمەر ئەگەر لە سەرەتاشەوە بە دڵەڕاوکێ و ترسێکەوە ئەم هەنگاوی دزییەی نابێ ، ئەوا لە دوایی دا ئەو بیرکردنەوەیە بەرەو خەملاندنی زیاتر دەچێ و ئەو گەمەی بەو یاسایانە دێ کە مرۆڤێك لەسەر دەورییە شۆرباوێکی خەڵکانی تر بە سێ مانگ بەندی مەحکوم دەکا و کەسانی تریش سەرەڕای چەوساندنەوەی هەزارانی وەك مام

هۆمەر و ڕووتاندنەوەی خەڵکی لە بەرامبەر یاسادا، ڕووسوورن و بەڕێزەوە پایەی چەوسێنەرانەیان هەڵدەسەنگێنرێ.

ئەوە ئەو ڕژێمە پۆخڵەواتانەن کە یاساکانیان بە بەری زوڵم و چەوساندنەوە و مشەخۆری دادەبڕن و وەك نوێنەری ئەو زوڵمەش حوکم دەکەن کە هەزاران مام هۆمەریان دروست کردووە. محەرەم محەممەد ئەمین لەم نۆڤلێتەیدا بە نەفەسێکی درێژەوە مەودای ڕووداوەکان والآ ناکا و چنینی ڕووداوەکان بروسکە ئاسا ڕایی دەکا. ئەوە لە کاتێکدا کاری ڕۆمان نووسین دروست کردنی ئەو فەزا درامییەیە کە پەلوپۆ بە ڕووداوەکان دەبەخشێ، ئەوە جگە لەوەی دەبێ حیسابی ئەوەش بۆ ئەو چیرۆکنووسە گەورەیەی کورد بکرێت کە ئەو لە سەردەمێکی زۆر دواکەوتوودا مەسەلەیەکی گرنگی وروژاندووە، مەسەلەی کاری سۆزانیەتی و هەڵخلیسکانی ئافرەتێك بۆ کاری لەشفرۆشی.

من ئەمزانیوە پێش ئەو مێژووەی محەرەم محەممەد ئەمین ئەو چیرۆکەی تێدا بلاوکردۆتەوە هیچ ڕووناکبیر و چیرۆکنووسێکی تر، توانیبێتیان ئەم مەسەلەیە بورووژێنن، ئەمەش زیاتر منەوەر بوونی ئەو زاتەمان بۆ ڕوون دەکاتەوەو ئەوەشمان پێ دەڵێ کە ئەو زیاتر لە ناو ڕووناکبیریەکی شاریدا ئیشی کردووە و مام هۆمەریش وەك بەرهەم چۆن سەرەتایەك بووە بۆ ڕۆمانی کوردی، ئەوا لەسەرێکی تریشەوە سەرەتایەك بوو بۆ گواستنەوەی قۆناغێکی مێژوویی دواکەوتوو بۆ قۆناغێکی پێشکەوتووتر کە ئەویش بازدانە لە کێشەی زەوی و جووتیار و کێشەکانی پەیوەندی بە لادێ و زەوییەوە و هەڵدانەوەی لاپەڕەیەکی نوێ لە تۆمارکردنی تاراستەیێکی نوێ ی ڕووناکبیری کە ئەویش باسکردنی کێشەی شار و هەراوهۆریای بازاڕ و کەسایەتی بازرگان و ڕەنجی حەماڵ و کرێکارانە کە لە بەرهەمێکی ئەدەبیدا و تایبەت لە چیرۆکدا بەم شێوازە ڕوونە خۆی بخاتە ڕوو.

مامۆستا محەرەم لە ڕووی بابەت و شێوازی هەڵبژاردنی ڕووداو و دابڕان لە کەرەسەکانی واقیع-ی بەر لە خۆی، وەك نوێخوازێك دێتە بەرچاوان، بەڵام لە ڕووی کەرەسەکانی دەربڕین و ستایلی داڕشتنی فیکرەکان و هونەری مۆدێرنی ئەوسا کە ئەم

چیرۆکی بیانی پیّ خویّندۆتەوە، نەیتوانیوە هەنگاویّکی پتەو و جیّگیر باویّت، ئەو بە هەمان موفرەدە و کەرەسەکانی دەربڕینی سەردەمەکەی خۆی ئەو بابەتە نویّخوازیانەی نووسیوە، واتە ئیشکالیەتی ئەو لە شیّوازی نووسیندایە لەو دەربڕینانەدایە کە پایە و دەسەلاّتی نووسینی ئەویان پتەو دەکرد.

ئەو لە نۆڤلیّتی مام هۆمەردا زۆرجار لە چیرۆکی گویّ ئاگردان و گیّڕانەوەیەکی سەرەتایی نزیك دەبیّتەوە کە ئەمە خالیّکی هەرە سەرەکی و لەبەرچاوە و ئەوە گرفتی ئەودشی بۆ دروست کردووە کە نەتوانیّ بەردەوامیەك بە وردەکاری ڕووداوەکان و ئالوگۆڕکیّی چنینەکان و لە دواییشدا بەخودی ئەو فۆڕمسازیە بدات کە هونەری ڕۆمان نووسین گەرەکیەتی. بەلاّم ئەزمونی پاش پیّنج سالّی تری بۆ سەرەتاکانی ڕۆمان لای ئەم نووسەرە، جۆریّك لە تیّپەڕاندنی تیّدایە بۆ بەرجەستەکردنی ئەو پەیامەی ئەو دەیەویّ بە هۆی نووسینەوە بیگەیەنیّ بەتایبەتی لە نۆڤلیّتی (ڕیّگای ئازادی) کە بەڕاستی دەکریّ ناو لەم بەرهەمە بنریّت نۆڤلیّت، هەرچەند لەمەشیاندا هیّندەی پابەندی تۆمارکردنی ڕووداو بیّت نەیتوانیوە هیّندە تەکنیکی هونەری فریای بکەویّت، بەلاّم بە بەراورد لەگەلّ مام هۆمەر کاریّکی جددیتر و هونەری ترە بە تایبەتی چاپە کۆنەکەی، واتە چاپی یەکەمی کە لە سالّی ١٩٥٩ لە چاپخانەی کامەران-ی سلیّمانی چاپی کردووە، لیّرەدا دەکریّ ئەو ناهەقییەی دەزگای سەردەم لە محەرەم محەمەد ئەمینی کردووە بخریّتە بەرچاو بەتایبەتی لەو ((ڕۆڤار))ەی کە بۆ ئەم نووسەرەیان دەرکردووە چەند بەخشندە بوون بۆ چاپکردنی هەندیّ لە بەرهەمەکانی لە ڕۆڤاردا، ئەوەندەش بیّ ئەمانەتییان کردووە لە چاپکردنی بابەتەکانی بە تایبەتی لە چاپکردنەوەی ئەم نۆڤلیّتە. ئەوان لە چاپکردنەوەی ((ڕیّگای ئازادی))دا، بە برگە لە نووسینی ئەم بەرهەمەیان قرتاندووە.

بۆ نموونە لە لاپەڕە ((٧))ی کتیّبەکە، (١٠) دیّریان قرتاندووە لە لاپەڕە (٩)، (٥) دیّریان قرتاندووە. لە لاپەرە (٦٠)، (٢) دیّڕ پەڕیّنراوە، ئەوە جگە زۆر لە کەم و کوڕی و هەلّەی تر.

نۆڤلێتی ڕێگای ئازادی کە لە کتێبێکی (٦٤) لاپەڕەییدا چاپکراوە، باس لە کەفوکوڵ و ئامادەباشی بۆ شۆڕشی ١٤ی گەلاوێژ دەکا و پاڵەوانی نۆڤلێتەکەش، عەبدولکەریم قاسم خۆیەتی.

ئەم بەرهەمەی محەرەم محەمەد ئەمین، لە ڕووی تەکنیك و جووڵەی ڕووداوەکانەوە، کارێکی دانسقەی سەردەمەکەی خۆیەتی بەتایبەتی لە ڕووی تێهەڵکێش کردنی ئەو بانگەواز و بەڵگەنامە ڕەسمی و سیاسیانەدا کە لەو قۆناغەدا بڵاوکراونەتەوە و ئەمە تەکنیکی نۆڤلێتەکەی پتەوتر کردووە و مەودایەکی بەرینتری داوەتە ڕووداوەکان و تۆمارێکی هونەریانەی ڕووداوەکانی ئەو سەردەمەن، ئەوە جگە لەوەی ئەو زەمانە سادەیەشی تێپەڕاندووە کە (مام هۆمەر)ی پێ نووسیوە.

محەرەم محەمەد ئەمین، هەموو بەرهەمەکانی بە چیرۆك ناوزەند کردووە، بەو دوو نۆڤلێتانەشەوە کە ئێمە لەم باسەدا هەڵوێستەیەکمان لەسەر کرد. دەکرێ خەڵکانی تریش بە هەمان پێناسە ناویان لەو دوو بەرهەمە نابێ، دەکرێ دان بەوەشدا بنرێ کە خۆشم بە ترس و گومانەوە ناوم لەو دوو چیرۆکە درێژە نابێ نۆڤلێت. بەڵام ئەوەی کە بێگومانم لێی ، ئەمانە سەرەتایەکی باشن بۆ ڕۆمانی کوردی و هەوڵی مرۆڤێکن کە لە سەردەمەکەی خۆیدا ویستویەتی ستایلێکی تری پێ بێ بۆ نووسینی چیرۆك، هەر وەك ئەوەی دنیابینییەکی تری پێبووە بۆ هەڵوێست وەرگرتن بەرامبەر ژیان و ڕووداوەکان. ئێمەش هەر زوو دانمان بەو گرفتە دانابێ کە لە پرۆسەی نووسینی ئەودا هەبووە، بەڵام نووسەری گۆرین، قەڵەمێکی بە برشت بووە بۆ سەردەمەکەی، بۆ تۆمارکردنی سەردەمێکی نوێ کە پێویستی بە بیرکردنەوە و تەکنیکێکی نوێ بووە بۆ تەعبیرکردن لەو سەردەم و قۆناغە.

===================================================

<u>تێبینی</u>: ئەم بابەتە لە گۆڤاری (ڕامان) ژمارە (٩٩) ی ساڵی ٢٠٠٥ دا بڵاوکراوەتەوە.

# دیستۆپیا لە چیرۆکی "زیندووی مردوو"ی محەرەم محەمەد ئەمین دا

د .ئازاد حەمە شەریف

**یەکەم: پێناسەی دیستۆپیا**

دیستۆپیا وشەیەکی گریکییە و لە دوو پارچە پێکهاتووە. (دیس- واتە خراپ) و (تۆپیا– واتە شوێن) . کەواتە دیستۆپیا شوێنێکی یەگجار ناخۆش و خراپە کە مرۆڤ تیایدا هەست بە ترس و ناناسوودەیی و دڵتەنگی دەکات. ئەگەر بەدوای پێناسەیەکی کورت و پوختدا بگەڕێین ، واباشترە سوود لەو پێناسەیەی (ویلیەم هارمۆن و هۆغ هۆڵمان) وەربگرین. بەڕای ئەوان دیستۆپیا **"شوێنێکی خراپە. دونیایەکی خەیاڵییە و بەئاسایی لە ئایندەدا وێنا دەکرێت."**

یەکەمین کەس کە ئەو وشەیەی بەکارهێنا بێت (جۆن ستیوارت میل) (١٨٠٦-١٨٧٣) بوو. ئەو فەیلەسووفە بەریتانییە بۆ یەکەمین جار لە مێژوودا وشەی دیستۆپیای لە وتارێکی پەرلەمانی دا لە ساڵی (١٨٦٨) بەکارهێنا بۆ وەسفکردنی بارودۆخی کۆمەڵگەی بەریتانیای ئەو سەردەمە.

ئەوەی ڕاستی بێت، تا کۆتایی سەدەی هەژدەهەم و سەرەتای سەدەی نۆزدەهەمیش زۆربەی نووسەران و بیرمەندان و فەیلەسووفانی دنیا بە ئاواتی دامەزراندنی کۆمەڵگەیەکی یوتۆپیایی پڕ خێروخۆشی بوون بۆ سەرجەم مرۆڤایەتی کە مرۆڤ لە سایەیدا بەئاشتی و ئاسوودەیی و بەختەوەری ژیان بباتەسەر. ئەم خەونە کە پڕ لە ئایندەیەکی ڕووناکە، لە ناوەڕاستی سەدەی نۆزدەهەم بەدواوە بەرەبەرە کاڵ و کاڵتر بۆوە تا سەرەنجام بوود مۆتەکەیەکی ترسناک بە ناوی دیستۆپیا کە هەڕەشە لە ژیان و دوارۆژی سەرجەم مرۆڤانی سەرزەوی دەکات.

**دووەم: ڕووداو و هۆکارەکانی پەیدابوونی دیستۆپیا**

گەلێك ڕووداو و هۆکار بەشداربوون لە پەیدابوونی ئەم گۆڕانە کتوپڕ و پێچەوانەیەدا. ئەگەر بەوردی بەدوای ئەو ڕووداو و هۆکارانەدا بچین کە بوونە هۆی گۆڕینی ڕوانینی گەشبینانەی مرۆڤ لە یۆتۆپیاوە بۆ ڕوانینی ڕەشبینانە کە لە دیستۆپیا دەردەکەوێت، دەتوانین ئەمانەی خوارەوە بە سەرەکی دابنێین:

أ) سەرەنجامی شۆڕشی فەرەنسی (١٧٨٩) کە دڕندایەتی و هۆڤگەرایەتی و کوشت و کوشتارێکی وای لێکەوتەوە کە تا ئەو دەمای لە مێژووی مرۆڤایەتی بێ وێنە بوو. هەرسێ دروشمی (ئازادی و یەکسانی و برایەتی) سەرەنجامەکەی بووە هۆی مل پەڕاندنی هەزاران کەس لە شوێنە گشتییەکان.

ب) زانست و دۆزینەوە زانستی و تەکنۆلۆژیەکانی سەردەمی شۆڕشی پیشەسازی لەجیاتی ئەوەی بۆ خێروخۆشی مرۆڤ بەکاربێت ؛ بۆ زێتر چەوساندنەوە و کۆنترۆلکردن و پەلبەستکردنی ئازادیەکانی تاك بەکارهات و بووە ئامرازێکی زۆر بەهێزی سیخوڕیکردن بەسەر مرۆڤەوە.

ج) (چارلس داروین) (١٨٠٩-١٨٨٢) کە لە ساڵی (١٨٥٩)دا کتێبی (دەربارەی سەرچاوەی جۆرەکان) بڵاوکردەوە. بیروڕاکانی ناو ئەو کتێبە هێندە هەژێنەر بوون کە کۆتایی یان بە هەموو جۆرە گەشبینی یەك هێنا. لەو کتێبەدا (داروین) باسی زۆرانبازی چەشنە بایۆلۆجییەکانی سەر ڕووی زەمین دەکات لەپێناو مانەوەدا. لەم زۆرانبازییەشدا ئەو چەشنە بایۆلۆژیانەی کە لەڕووی توانا جەستەیی و هزریەکانەوە خۆیان لەگەڵ دەوروبەر دەگونجێنن، تەنیا ئەوانن کە دەتوانن لەو جەنگەی مان و نەماندا بەزیندوویی بمێننەوە و درێژە بە ژیانی خۆیان بدەن.

د) فرێدریك نیتشە (١٨٤٤-١٩٠٠): یەکەمین کەس بوو لە مێژوودا کە مەرگی خواوەندی ڕاگەیاند. بەڕای ئەو مرۆڤ چیتر نابێت جگە لەخۆی پشت بە کەس ببەستێت چونکە ئەگەر مرۆڤ بیەوێت لە ژیاندا سەرکەوتوو بێت پێویستە ئەو بەخۆی پەرە

بەتوانا و وزەکانی خۆی بدات و ببێتە سوپەرمان و شوێنی ئەو بگرێتەوە. ئەم رایەی نیتشە کاریگەریەکی زۆر خراپی کردە سەر روانینی خەڵك بەرامبەر بە ژیان و دوارۆژی مرۆڤ و زۆر بەبەربادی وایکرد خەڵك بێ هیوا بن و رەشبینانە لەم ژیانە بڕوانن.

هـ) سیگمۆند فرۆید (١٨٥٦-١٩٣٩): ئەویش رۆڵێکی یەکجار کاریگەری گێڕا لە گۆڕینی روانینی گەشبینانەی مرۆڤ بۆ رەشبینی. بەڕای ئەو لەبەر سێ هۆی سەرەکی مرۆڤ لەم سەرزەمینەدا هەرگیز ناتوانێت بەختەوەری بەدەست بهێنێت. ئەوانیش بریتین لە:

یەکەم: زل و زەبەلاحی هێزەکانی سروشت،

دووەم: لاوازی و بێهێزی جەستەی مرۆڤ،

سێیەمین: غەریزە فەوتێنەرە کوێرانەکەی ناو جەستەی مرۆڤ.

و) کارڵ مارکس(١٨١٨-١٨٨٣) ئەو بیرمەندە مەزنە رایگەیاند کە هەر لەسەرەتای مێژووەوە ململانێی مرۆڤ ململانێی چینایەتی بووە و کۆمەڵگەی مرۆڤایەتی لەئەنجامی ئەو ململانێ یە چینایەتیەوە قۆناغ بە قۆناغ بەرەوپێش دەچێت و بە قۆناغەکانی (کۆمەڵخوازی سەرەتایی - کۆیلایەتی - دەرەبەگی - سەرمایەداری - سۆسیالیزم) دا تێدەپەڕێت. لەهەریەك لەم قۆناغانەشدا ململانێی توندوتیژ کراوە و قوربانی بێژماریش دراوە و دەشدرێت. ئەمەش ئەو واتایەی لێدەکەوێتەوە کە بەختەوەری مرۆڤ بەبێ قوربانیدان دەستەبەر ناکرێت.

ز) هەڵبەتە هەردوو جەنگی یەکەم و دووەمی جیهان رۆڵی کاریگەریان گێڕا لە رەشترکردنی روانینە رەشبینانەکەی مرۆڤی سەردەم و ئەمەش وایکرد کە نووسەران و بیرمەندان و فەیلەسووفانی رەسەن و پابەند بە کێشەکانی کۆمەڵگە و مرۆڤایەتی لە هەرکوێیەکی ئەم سەر زەمینە بن بەشێوازی جۆراوجۆر ئەم رەوتە پڕ لە رەشبینیەی دیستۆپیا لە کارەکانیاندا دەربکەوێت. هەرئەمەش وایکردووە کە میللەتی کوردیش بەحوکمی ئەوەی کە سەدان ساڵە لەژێر کۆت و باری جەور و ستەمدا دەناڵێنێت و باجی زۆری سیاسەتە جۆربەجۆرەکانی دنیا و بە هەڵە لە سیاسەت گەیشتن و بەرهەمی تەکنۆلۆژی داوە، ئەم روانینە زۆر بەخەستی لە

گەلێك لایەنی ژیانیدا رەنگی داوەتەوە.

جا هیچ سەیر نییە کە نووسەرێکی وشیار و رۆشنبیر و لە دنیا بەئاگای وەکو (محەرەم محەمەد ئەمین) ئەگەر بەشێوەیەکی نائاگایانەش بوو بێت ئەم رەوتە نوێیە و ئەم روانینە نوێیە کاری تێکردبێت و ئەم رەوتە لە چیرۆکێکی وەکو (زیندووی مردوو) دا رەنگ بداتەوە.

### سێیەم: ئاکار و سیفەتەکانی دیستۆپیا

لە کۆمەڵگەی دیستۆپیدا بەزۆری ئەم ئاکار و جیاکەرەوانە بەرچاو دەکەون (کە زۆربەیان لە چیرۆکی "زیندووی مردوو"دا بەدیار دەکەونەوە).

١) دەسەڵات رۆڵێکی گەورە دەگێڕێت و کۆنترۆڵی بەسەر هەموو شتێکەوە هەیە هەر لە ژیانی تایبەتی تاکەکانەوە تا دەگاتە سەرجەم لایەنەکانی تری کۆمەڵگە.

٢) دانیشتوانی کۆمەڵگەی دیستۆپی بەتوندی لەسەر یەکرایی راهاتوون و ئەمەش لە ئەنجامی شۆردنەوەی مێشکی ئەوانەوەیە کە ئایدیۆلۆژیا نەك زانیاری ئاراستەیان دەکات (جا ئەم ئایدیۆلۆژیایە ئایینی بێت یان سیاسی).

٣) لە کۆمەڵگەی دیستۆپیدا سەرۆك و سەرکردەکان هەمیشە بەهێزن و مێگەلێك پاسەوان و یاساوڵ و کاربەدەستانی گوێڕایەڵ و سیخوڕ و راپۆرتنووسیان بەدواوەیە.

٤) جۆرە مەنگییەکی سەرسامکەر لە کۆمەڵگەی دیستۆپیدا هەیە و هەرگیز هیچ گۆڕانکارییەکی تێدا روونادات و هەرکەسێکیش باسی گۆڕانکاری بکات سزای خۆی وەردەگرێت.

٥) چەوساندنەوە و سەرکوتکردن هەمیشە دەبنە هۆی یاخیبوون و یاخیبووانیش تەنیا دوو رێگایان لەپێشە یان پەشیمانی و ریسوابوون یان زیندانکردن و لەناوچوون.

٦) لە کۆمەڵگەی دیستۆپیدا ئەوپەڕی نامرۆڤایەتی دەرهەق بە مرۆڤایەتی و مافەکانی مرۆڤ دەکرێت ، بەڵام کەس بەئاشکرا ناوێرێت نارەزایی دەرببڕێت ئەگینا تووشی لێپێچانەوەی سیاسی دەبێت.

٧) نووسەرانی ئەم جۆرە چیرۆکانە بەزۆری چیرۆکەکانیان دەخەنە ناو چوارچێوە و دەوروبەرێکی خەیاڵییەوە و وادەردەخەن کە زۆربەی جار ئەو کۆمەڵگایانە لە دوارۆژدا دروست دەبن . کەچی مەبەستی راستەقینەی ئەوان رەخنەگرتنە لەو کۆمەڵگەیەی کە بە خۆیان لەکاتی ئێستادا تیایدا دەژین. بۆیەش ئەوان وادەکەن تاوەکو خۆیان لە چنگی سانسۆر دەرباز بکەن و تووشی لێپێچانەوەی یاسایی و سیاسی نەبن.

٨) سیستەمی پەروەردە و دەزگاکانی راگەیاندن و هەر هەموو دامودەزگا فیکرییەکان پابەندی هێز و حیزبی دەسەڵاتدان و ئەو ئایدیۆلۆژیایەی کە بڵاویشی دەکەنەوە ئایدیۆلۆژیای حیزبی دەسەڵاتدارە و هەر لە خزمەتی ئەو حیزبە دایە.

٩) کاتی پشوو و حەسانەوە لە کۆمەڵگەی دیستۆپیدا زۆر کەمە و کاتی خۆش رابواردن کەمتریشە. تەنانەت منداڵانیش کاتی یاری و گەمەیان لێ کەمکراوەتەوە و کاتی ئەوانیش دراوەتە دەم پەروەردەکردنی ئایدیۆلۆژیانە.

١٠) کۆمەڵگەی دیستۆپی لە شاری زل و زەبەلاحدا بەرچاو دەکەوێت کە تاکەکان تیایدا بێ هێز و بێ هیوا و ورە رووخاون. زۆربەی جارانیش ئەو شارانە بێ ناون یان ناوێکی وایان هەیە کە لە هەموو دنیادا ناوی وا نی یە.

١١) کارێکتەرەکانی/ کەسانی کۆمەڵگەی دیستۆپی کەسانی رووکەش و کارتۆنی و تاك رەهەندن. ئەوان تەنیا لایەنێکی ژیان نەك سەرجەم ژیان دەبینن. زۆرجاریش کارێکتەرەکان کەسانی بێ ناون.

١٢) لەپشتەوەی کۆمەڵگەی دیستۆپیدا هەمیشە چیرۆکێکی شەڕ، شۆڕش یان راپەڕین هەیە.

١٣) تەکنۆلۆژیا و بەرهەمەکانی تەکنۆلۆژیا زۆر بەخەستی هەموو روخسارەکانی کۆمەڵگەی دیستۆپی داپۆشیووە و زۆربەی کات تاکەکانی کۆمەڵگە بە پێشکەوتووترین بەرهەمی تەکنۆلۆژیاوە سیخوڕیان بەسەردا دەکرێت.

١٤) تاکەکانی کۆمەڵگەی دیستۆپی هەمیشە نە لە ژیانی خۆیان و نە لە

ژیانی گشتی رازین و هەمیشە لەکۆتاییدا ئەوان دەبنە قوربانی. زۆرکاتیش لە پەراوێزی کۆمەڵگەی دیستۆپیدا گرووپێکی ناگوێڕایەڵ بۆ یاسا و ڕێساکانی دەسەڵات پەیدا دەبن، بەڵام ئەوان هەرگیز ناتوانن بگەنە دەسەڵات و دەسەڵات بگرنە دەست.

١٥) دانیشتوانی کۆمەڵگەی دیستۆپی هەمیشە کەسانی بەکاربەرن نەك بەرهەمهێن. هەرچی پارە و سامانیشیان هەیە بەردەوام لە شتی کەمالیاتدا (زێدەکی یاخود نابنچینەیی) خەرجی دەکەن.

١٦) کۆمەڵگەی دیستۆپی لە زۆر ڕووەوە بە کۆمەڵگەی هاوچەرخ دەچێت ، بەڵام هێشتا لەسەداسەد وەکو یەك نیین.

١٧) هەمیشە کەسێکی دەرەکی لە دەرەوەی کۆمەڵگەی دیستۆپیدا هەیە. بەڵام ئەو کەسە دەرەکی یە کەمجار وایە دەبێتە شاکەسی چیرۆکەکە و بۆیە هەر بە پەراوێز دەمێنێتەوە.

١٨) لە کۆمەڵگەی دیستۆپیدا پیاوسالاریەکی لەڕادەبەدەر هەیە. مێیینەکانیش هەمیشە پەراوێزخراون و ئەوان بۆ چێژ و خۆشی وەرگرتنی دەسەڵاتداران دەژین و لە ژیاندا هێلراونەتەوە.

١٩) تێکدان و هەڵوەشاندنەوەی کۆمەڵگەی دیستۆپی کارێکی سەخت و نیمچە ئەستەمە.

٢٠) لە کۆمەڵگەی دیستۆپیدا هەمیشە ڕاستییەکان لە خەڵکی دەشاردرێنەوە یان بەچەواشەکراوی دەکەونە بەردەست. دەسەڵاتداران لەجیاتی ڕاستییەکان دروشمەکانی خۆیان دەکەنە ڕاستییەکی باوەڕپێکراو.

٢١) لە کۆمەڵگەی دیستۆپیدا هەمیشە سەرکردەیەك/ سەرۆکێك هەیە تارادەی پەرستن پیرۆزکراوە و زۆربەی کات خۆی لە خەڵك دەدزێتەوە و زۆربەکەمی خۆی بە خەڵك نیشان دەدات.

**چوارەم : دیستۆپیا لە چیرۆکی "زیندووی مردوو"دا**

هەر لە ناونیشانی چیرۆکەکەی (محەرەم محەمەد ئەمین)ەوە رەشبینی و نائومێدیەکی گەورە هەست پێدەکرێت. ئەم ناونیشانە سەرنج راکێشە هەر لە سەرەتاوە پێماندەڵێت تەماشای زیندووەکان مەکەن وەکو زیندوو چونکە ئەوانە لەراستیدا مردوون و بەهەڵە بە زیندوو حیساب کراون. بە واتایەکی تر ، کەسانی ناو ئەم چیرۆکە هەرهەموویان وەکو زیندوو دێن و دەچن و دەجوولێنەوە ، بەڵام چونکە ئەوان بەهیچ جۆرێك شتێکی سوودبەخش و مانادار بۆ کۆمەڵگەکەیان ناکەن بۆیە ئەوان مردوون. هەڵبژاردنی ناونیشانێکی وا سەرنج راکێش و نووسین لەبارەی بابەتێکی وا بایەخدار و لەسەر ئەو ئاستە هێماییە بەرزە چیرۆکەکەی تا لووتکە بەرزکردۆتەوە.

ئەم چیرۆکە دوو کۆمەڵگەمان بۆ دەخاتەروو. کۆمەڵگەیەك لە کاتی ئێستادایە و خەڵکەکەی ئەو کۆمەڵگەیە لە ژیان بێزارن و نازانن کاتی خۆیان چۆن بکوژن . خەڵکەکە بۆ کوشتنی کات روو لە چایخانە دەکەن و کاتی خۆیان بە دانیشتن لەسەر قەنەفە و یاری نەزنیف و دۆمینە و قسەی هیچ وپووچ و یاریکردن بە تەسبێح و سەیرکردنی رۆژنامە و باوێشك دان وچاوخستنەسەر کاتژمێر و یاریکردن بە زیخ و لمی سەر سۆپای چایخانەکە بەسەر دەبەن.

کۆمەڵگەی دووەم کۆمەڵگەیەکی ناراستەقینەیە کە خەیاڵی "مام دەروێش" بە مەبەستی پێك گرتن و پێك بەراوردکردن لەگەڵ ئەوەی یەکەمیان نەخشاندوویەتی. ئەم کۆمەڵگەیە لە شارێکی بێ ناو و لە سەردەمێکی نادیاردایە کە خەڵکانی ئەوێ هەر بەراستی مردووەکانیان بەزیندوو تێدەگەن و هیچ باکیان بەوە نییە کە مردووەکانیان بنێژن. مردووەکانی ئەوێ وەکو بارەدار لە مزگەوت و سەرشەقام و بازارەکان هەڵچنراون. بەڵام کەس هەست بەوە ناکات کە ئەوان مردوون و بۆنی کەلاکی بۆگەنیان هیچ کەسێکیش گێژ ناکات جگە لە کەسانی لایدەی وەکو "مام دەروێش" ی چیرۆك گێرەوە. جا چونکە خەڵکی ئەو شارە خەیاڵییە چاویان لە

بینینی ئەم دیمەنانە و لووتیان بە بۆنکردنی ئەو بۆنانـەوە راهـاتوون و هێنـدە ئـەو کەلاکانەیان بینیووە و بۆنکردووە تا هـەموو هەسـتێکی بیـنین و بۆنکردنیـان لـەلا مردووە و کەس چیتر هیچ نابینێت و بۆنی هیچ ناکـات جگـە لـە کەسـێکی چـاو و لووت رانەهاتووی وەکو "مام دەروێش".

لـە هـەمووی سـەیرتر ئەوەیـە کـە خـەڵکی ئـەو شـارە خـەیاڵی یـە بـە زانـا و گەوجەکانیـەوە ئـەو کەلاکانـە بـە مـردوو نـازانن و بـە زینـدوویان دادەنـێن و ئـەو کەلاکانەیان لەلا بەقەد هەر کەسێکی زیندوو خۆشەویستە.

"مام دەروێش" (کـە هێمـای کەسـێکی دنیادیتـەی مێـشك کراوەیـە) دەیـەوێت هۆشیاری و گۆڕانکاری لە عەقڵی خەڵکی شارە خەیاڵییەکە بەرپا بکات بەوەی داوایان لێدەکات ئەو مردووانە بەزوویی بنێژن ئەگینا هەموویان دەردەدار دەبن و دەفـەوتێن . یەکەمین کەس کە "مام دەروێش" رووی تێدەکات فەقێیە ،( کە ئەویش هێمای نەوەی نویێ ی خوێندەوارە) و دوای ئەویش روو دەکاتە مەلای مزگەوت ( کە هێمای کەسـانی زانست بەخش و پەروەردەکارانە). بەڵام نە فەقێ و نـە مـەلا و نـەهیچ کەسـێکی تـر پشتگیری لەو رایەی "مام دەروێش" ناکەن. بەپێچەوانەوە هەر ئەوانن کـە دەیانـەوێت بە زووترین کات کەسانی وەکو"مام دەروێش" لەو نـاوە نـەمێنێت. بۆیـە هۆشـداری پێدەدەن کە تا زووە دەبێت خۆی دەرباز بکات دەنا خەڵکەکە بـەو قـسانەی بـزانن زۆر زەحمەتە بەسەلامەتی دەرباز ببێت. رەنگیشە هەر فـەقێ و مـەلا زمانیـان لـە "مـام دەروێش" دابێت و خەڵکیان لێـی گـاڵ دابێـت تـاکو بـەدوای بکـەون و شـاربەدەری بکـەون. رووداوی راوەدوونـان و شـاربەدەرکردنی "مـام دەروێـش" لەلایـەن خـەڵکی شارەکەوە رووداوێکی هێماییە چونکە لەوێدا کەسانی گەوج و نـەزان مرۆڤـی هۆشـدار راو دەنێن. ئەم دیاردەیەش ئاکاری هەموو کۆمەڵگەیەکـە کـە مرۆڤـانی دواکـەوتووی عەقڵ خێڵەکی حوکمی تیا دەکەن. هەر ئەم رووداوە هێماییە لە جیهانی ئـابووری دا بەوە لێك دەدرێتەوە "العملة الرديئة تطرد العملة الجيدة" واتـە " دراوی خـراپ دراوی باش بەدەر دەنێت".

هەڵبەتە "مام دەروێش" بۆیە ئەو چیرۆکەی بۆ پاڵەوانە بێ ناوەکەی چیرۆکەکە گێڕاوەتەوە چونکە ئەو لە ڕێگای تەکنیکی هاوبابەتییەوە ((Objective Correlative)) دەیەوێت بە پاڵەوانی ئەم چیرۆکە و بەخەڵکی دیش بڵێت کە خەڵکی ئەو شارەی کە چایخانەکەی تێدایە و خەڵکی شارە بێ ناوە خەیاڵیەکەی ناو چیرۆکەکەی "مام دەروێش" هەردووکیان بە لاشە زیندوون بەلام بە بیر و مێشك مردوون. هەربۆیەش بەلای منەوە هەردوو کۆمەڵگە هەریەکن و خەیاڵی زیندوو و فراوانی "مام دەروێش" بۆ بەتێنکردنی هەستی پاڵەوانی چیرۆکەکە و خوێنەر کردوونی بە دووان. بۆ سەلماندنی ئەو ڕایەش، لە کۆتایی چیرۆکەکەدا کاتێك دەمەتەقێ دەکەوێتە نێوان "مام دەروێش" و شاکەسی چیرۆکەکە "مام دەروێش" بە ڕاست و ڕەوانی بە شاکەسەکە دەڵێت:

**"تۆ خۆت وا ئێستا لەم شارەدا ئەژی کەچی چاوت کوێر بووە، ئەم مردووانە نابینی...لووتیشت گیراوە بۆنی بۆگەن ناکەی ... ئا سەیرێکی دەرەوە بکە!"**

(مردووی زیندوو، ل ٦٣)

دوای ئەم قسانە شاکەسی چیرۆکەکە هەر لەسەر داکۆکیکردن لە قسەکانی خۆی مکوڕ دەبێت، بەلام "مام دەروێش" بەم چەند ڕستەیە کۆتایی بەو مشتومڕە دەهێنێت و بەیەکجاری بۆ شاکەسی چیرۆکەکە دەسەلمێنێت کە ئەو کۆمەڵگەیە خەیاڵی و ئەو شارە بێ ناو و ناونیشانەی لە سەرەتاوە بۆی باسکردووە هەمان ئەو شارەیە کە ئێستا ئەوان لەناویدا دەژین و زیندووە مردووەکانیش هەمان ئەو کەسانەن کەوا لەبەردەمیان بەبێهوودەیی دێن و دەچن و ژیان بەسەردەبەن.

"مام دەروێش" دوای ئەختێك بێدەنگی وا بەڕووی شاکەسەکەدا دەتەقێتەوە:

**"دەئینجا پێم بڵێ ئەوانەی لەو شەقامەدا دێن و دەچن چەندیان زیندوون؟! دەی قسە بکە! بۆ وا دەمت بووە بەتەڵەی تەقیوو، ئایا ئەوانە مردوو نین گلۆر کراونەتەوە! ئاخۆ مردووی ئەنێژراو نین؟! کوا گۆڕهەڵکەن و گۆڕستان!"**

بەواتایەکی دی ، "مام دەروێش" دەیەوێت بەشێوەیەکی زۆر هێمایيانە پێمـان بڵێـت ئەوانەی ناتوانن "گۆڕان" لە کۆمەڵگەکەیان بەرپا بکەن دەبێت بەردرێنە گۆڕسـتان"!

خـاڵێکی تـری سـەرنجڕاکێش لـەم چـیرۆکەدا دانـانی ئـەو گوتـە بەناوبانگـەی زەردەشتی مەزنە کە دەڵێت: "بیری چاك، وتەی چاك ، کردەوەی چـاك" یـەکسـەر لەدوای ناونیشانی چیرۆکەکە. گومان لەوەدا نییە کە (محەرەم محەمەد ئەمین) هـەر لەخۆوە و بێ مەبەسـت ئەمـەی نـەکردووە. بـە ڕای مـن ، چـیرۆکنووس هـەر لـە سەرەتای چیرۆکەکەوە دەیەوێت ئەو پەیامە بـە خوێنـەر بگەیـەنێت کـە پێویـستە سەرجەم مرۆڤایەتی پەیڕەوی بیری چاك بکەن و وتەی چاك هەمیشە لەسەر زاریـان بێت و ژیانیان لە پێناوی کردەوەی چاك تـەرخان بکـەن، ئـەگینا ئـەوانیش دەبنـە زیندووی مردوو.

کەواتە ئەو پەیوەندیەی کە لە نێوان ناونیشانی چیرۆکەکە و گوتەی زەردەشت و ناوەرۆکی هـەردوو چـیرۆکدا هەیـە پەیوەندیـەکی هـارمۆنی و یـەکتر تەواوکـەرە. هەروەك چـۆن چـیرۆکە خـەیاڵی یەکـەی "مـام دەروێـش" تەواوکـەری چـیرۆکە دەرەکییەکەیـە. تـەکنیکی چـیرۆك لـەناو چـیرۆك کـە هاوبابـەتی لێکەوتۆتـەوە و جێگۆڕکێکردن بـە گێـڕەرەوەی چـیرۆك (چـونکە لـە سـەرەتادا چـیرۆك گێـڕەرەوە پاڵەوانە بێ ناوەکەی ناو چایخانەکەیە ، بەڵام دواتر "مام دەروێش" دەبێتە چیرۆك گێڕەرەوە و ئەوەکەی تر دەبێتە گوێگر) دوون لە کاریگەرترین تەکنیك کە نووسـەر زۆر وەستایانە و لێزانانە بەکاری هێناون.

ئەم چـیرۆکەی (محـەرەم محەمـەد ئـەمین) دەکرێـت زۆربـەی ئاکـار و سـیفەتەکانی دیستۆپیای تێدا بدۆزرێتەوە. لەمانەش بۆ نموونە: بەهێزی دەسەڵاتی ئایینی و بەکرایی خەڵکی شارە خەیاڵی و راستەقینەکە و کاریگـەری ئایـدیۆلۆژیای بـاو و شـۆردنەوەی مێشکی خەڵکی و مەنگی کۆمەڵگەکە و مێگەلایەتی خەڵکی ئاسایی و چەوساندنەوە و سەرکوتکردنەوەی کەسانی لادەر و گۆڕانخواز و ڕۆڵـی بـەهێزی سـانسۆری فیکـری و خەریکبوونی بەردەوامی خەڵکی بەشتی هیچ و پووچ و بێ مانـا و بـوونی کەسـایەتی

تاك ڕەهەند و کارتۆنی و پەیدابوونی کەسێکی دەرەکی وەکو چاودێری ئەو کۆمەڵگەیە و دیاردەی پیاوسالاری و نیمچە ئەستەمایەتی تێکدان و هەڵوەشاندنەوەی ئەو کۆمەڵگەیە. هەر هەموو ئەو ئاکارانەی سەرەوە زۆر بەڕوونی لەو چیرۆکە مەزنە سەرسوڕهێنەرەدا دەبینرێن. بۆیە بەڕای من چیرۆکی "زیندووی مردوو" نموونەیەکی ڕاستەقینەی چیرۆکی دیستۆپییە لە ئەدەبی کوردی دا و ڕەنگە بە هەڵەشدا نەچووبم ئەگەر بە یەکەمین چیرۆکی دیستۆپی لە ئەدەبی کوردی دابنێم.

بەهێزی بابەتی چیرۆکەکە و باڵادەستی چیرۆکنووس لە بەکارهێنانی تەکنیکە جۆربەجۆر نوێیەکانی چیرۆك و زاڵی نووسەر بەسەر زمانی نووسیندا و پووختی و پاراوی شێوازی دەربڕین وایکردووە کە تەنانەت دوای تێپەڕبوونی پتر لە نیو سەدە بەسەر نووسینی ئەو چیرۆکەدا ، چیرۆکەکە هەمان گەرم و گوڕی جارانی تێدا بمێنێت و سەرسامییەکی گەورە بە خوێنەر و ڕەخنەگران ببەخشێت . لەپاڵ ئەمانەی باسکران، ئەم چیرۆکە چیرۆکێکی هێندە زیندووە هەر دەڵێی بۆ ڕۆژگار و سەردەمی ئەمڕۆمان نووسراوە.

هەولێر: ٢٤/٧/٢٠٠٩

## سەرچاوەکان

١) محەردم محەمەد ئەمین ، کۆبەرهەمە ئەدەبی و سیاسی و فەلسەفیەکانی (سلێمانی: چاپخانەی دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم، ٢٠٠٨)

٢) William Harmon and Hugh Holman، A Handbook to Literature، (New Jersey: Prentice Hall، ٢٠٠٣)

٣) هەموو زانیاریەکانی تر کە لەبارەی دیستۆپیاوە لەو نووسینەوەدا بەکارهاتوون لە دکتۆرانامەکەی خۆمم وەرگرتووە کە ئەمە ناونیشانەکەیەتی:

٤) Azad Hamad Sharif, "Dystopia in Modern British Fiction: An Analytic Study of Wells's، Huxley's and Orwell's Novels" (Unpublished PhD Dissertation Submitted to the University of Koya) May, ٢٠٠٨.


==========================================================

تێبینی: ئەم بابەتە لە گۆڤاری نەوشەفەق ژمارە (٧١) ی ئاداری ٢٠٠٩دا بلاوکراوەتەوە.

# دوو دنیابینی جیاواز: دەروێش و مەلا لە چیرۆکی "زیندووی مردوو"دا

د .ئازاد حەمە شەریف

## یەکەم: پێشەکی

چیرۆکی "زیندووی مردوو" یەکێکە لەو چیرۆکە کوردییانەی کە دەکرێت لەسەر چەندان ئاست بخوێنرێتەوە و لێکدانەوەی جۆراوجۆری بۆ بکرێت. لە لێکۆڵینەوەکەی پێشترماندا لە گۆشەنیگای دیستۆپیاوە تەماشای ئەم چیرۆکەمان کرد. بەڵام لێرەدا لە گۆشەنیگای دوو هێمای ئاینیەوە کە (دەروێش) و (مەلا)ن لەم چیرۆکە دەکۆڵینەوە. ئەوەی زۆر سەیرە ئەوەیە، ئەم دووانە هەردووکیان لە یەك سەرچاوەی بڕوای ئاینییەوە هەڵقوڵاون و زادەی هەمان بنەمان، کەچی لەناو خودی ئەم چیرۆکەدا زۆر پێچەوانە دەردەکەون. هەربۆیەش دەکرێت بەراوردیان لەنێوان بکرێت بۆ ئەوەی بگەینە ئەو هۆکارانەی رۆڵیان گێڕاوە لە پەیدابوونی ئەم دوو دنیابینییە جیاوازە. ئەم لێکۆڵینەوەیە هەوڵێکە بەم ئاقارەدا و لە کۆتاییدا سەرەنجامی وای لێدەکەوێتەوە کە زۆربەی خوێنەران چاوەڕوانی ناکەن.

## دووەم: دنیابینی دژبەیەکی دەروێش و مەلا

وەکو هەموو لایەك ئەوە چاك دەزانێت کە دەروێش و دەروێشایەتی لە بنەڕەتەوە رێباز و لێکدانەوە و دنیابینی و گەڕان بەدوای راستییەکانی بوون و ژیان بووە نەك پیشە و بژێوی پەیداکردن. دەروێشە کوردەکان هەر لە سەرەتای پەیدابوونی هەردوو تەریقەتی قادری و نەقشییەوە تا ماوەیەکی دوورودرێژ موریدی رێگای هەقپەرستی و وێڵی دوای رێگای راستی بوون. هەر بۆیەش ئەوان سنووری جوگرافی وڵاتانیان بڕیووە و ئەم دێ و ئەو دێ و ئەم شارە و ئەوشار و ئەم وڵاتە و ئەو وڵاتیان کردووە بۆ گەیشتن بەو راستییانەی کە ئەوان

بەدوایاندا وێڵ و سەرگەردان بوون. لە ئەنجامی ئەم گەڕان و سووڕانە بێ وچانەشیاندا دەیان ئەزموونی تاڵ و شیرینیان چەشتووە و شتی سەیروسەمەرە فێربوون و لە ژیان و مانای ژیان گەیشتوون. هەر ئەم گەڕان و سووڕانە بەردەوامەشیان وای لێکردوون گۆڕانکاری لە ژیان و شوێن و ئاووهەوا و جلوبەرگ و داب و نەریت و سیستەمی کۆمەڵایەتی خەڵکی هەست پێ بکەن. بێگومان یەکەمین پرۆسەش لە دروستبوونی دنیابینی لە چاوەوە دەست پێدەکات. بەبینی ئەم هەموو شتە جیایانە و بەبیستنی ئەم هەموو بیروباوەڕە جیاوازانە ئەوانیش بەبێ ئەوەی هەستیشی پێ بکەن گۆڕانکاری لە دید و روانین و دنیابینیان پەیدا بووە. جا کاتێك لە مام (دەروێش) دەپرسرێت خەڵکی کوێیە، ئەو بێ سێ و دوو دەڵێت :"خەڵکی هەموو جێگایەکم"* کە ئەمەش ئەوپەڕی مێشك کراوەیی و هۆشیاری دەروێشەکە دەردەخات.

بەپێچەوانەشەوە، مەلا و فەقێ (جگە لە هەندێك مەلای زۆر گەڕیدە و رۆشنبیری وەکو جزیری و خانی و مەولەوی و نالی و حاجی قادری کۆیی و عەلائەدین سەجادی و چەندانی تر) تا پێیان کرابێت حەزیان کردووە لە شوێنێك بگیرسێنەوە و دابمەزرێن و ماڵ و حاڵێك بۆ خۆیان پێکەوە بنێن و لەوێوە پەرە بە بڵاوکردنەوەی زانستە ئاینیەکەیان بدەن و کاروباری خەڵك رێك بخەن. ئەوان هەمیشە لە هەوڵی ئەوە دابوونە کە خەڵك بەو جۆرە سیستەمە ئاینیە رابهێنن کە کتێبەکانیان دەقاودەق فێری کردوون بەبێ ئەوەی مووێك لە رێنماییەکان بچنە دەرەوە یان راڤە و لێکدانەوەی هاوچەرخانە بۆ دەقە کۆنەکان بکەن. هەرچەندەش رۆژگار و زەمانە و شوێن گۆڕانکاری بەسەریشدا هاتبێت ئەوان ئامادە نەبوون رێگای هیچ جۆرە گۆڕانکارییەك و روانینێك و دنیابینییەکی جیاواز لەوەی خۆیان پێ فێرکراون بدەن. چونکە گۆڕانکاری و روانینی جیاواز لە کۆمەڵگەدا سەرەتا هەمیشە پشێوی و بێ سەروبەری لێدەکەوێتەوە و سیستەمی ئاینیش هەمیشە مەیلی لە یەکڕەنگی و یەکدەنگی و یەك ئاراستەیی و تاك دنیابینییە. جا هەندێك لەم مامۆستا

---

* محەرەم محەمەد ئەمین : کۆبەرهەمە ئەدەبی و سیاسی و فەلسەفییەکانی (سلێمانی: چاپخانەی دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم، ٢٠٠٨) ل ٥٨

ئاینییە بەرێزانە لە جیاتی ئەوەی بن بە مەشخەڵی گۆڕانکاری لە کۆمەڵگەکەیاندا، ئەوان بوونەتە ڕێگر لەبەردەم هەموو جۆرە گۆڕانکارییەك. بەم جۆرە فێرکاریەشیان نەوەیەکی دەستەپاچە و بێ ڕوانین و بێ دیدە و پاسیڤییان دروستکردووە.

ئەگەر لە کەسایەتی هەریەك لە دەروێش و مەلا (وەك لەم چیرۆکەدا هاتووە) وردتر ببینەوە، هیچ گومانی تێدا نییە کە زۆر لایەنی جیاواز و لێك نەچوو لە بیرکردنەوە و کەسایەتی ئەم دووە لەبەرچاومان زەق دەبنەوە. دەروێش هەمیشە وەکو تاکێك، بەلام تاکێکی ملکەچ نەکەر و یاخی و سەربەخۆ لە کۆمەڵگەدا ڕەفتار دەکات و هەوڵی ئەوەش دەدات کە هەموو تاکەکانی کۆمەڵگە وەکو خۆی خاوەن بیرکردنەوە و ڕوانینی تاکانە بن و بەچاوی خۆیان نەك بەچاوی خەڵکانی تر دیاردە و ڕووداوەکان ببینن و بڕیاری ڕاستی و ناڕاستی شتەکانیش لە دەست خۆی نەك خەڵکانی تردا بێت.

بەلام مەلا بە حوکمی ئەوەی زێتر بەلای بە دەزگاییکردنی ئاین و ڕێ و ڕەسمە ئاینییەکاندا دەچێت، زۆر بەبەردەوامی خۆی و شوێنکەوتەکانی هەوڵدەدەن هەموو دەنگێکی تاکپەروەرانە لە کایەی خۆیان دوور بخەنەوە. جا ئەوان لە ڕێگای فێرکردنی بەردەوامی کۆمەڵێك فەقێ و سوختە و تازە مەلایانەوە هەمیشە هەوڵی چەسپاندن و سەپاندنی ڕێنماییەکان بەسەر تاکەکانی ناو کۆمەڵگەوە دەدەن و مەبەستی سەرەکیش لەمە ئەوەیە هەموو جۆرە جیاوازیەك لە ڕوانینی تاکەکاندا نەهێڵن و یەك جۆرە ڕوانین و یەك جۆرە بیرکردنەوە بخولقێنن. جا هەربۆیەشە ، بەردەوام دەوروبەری مەلا و ناو مزگەوتەکان زیاتر پشت بە گرووپ و ڕوانینی بە کۆمەڵ نەك ڕوانینی تاکخوازانە دەبەستێت.

لایەنێکی دیکەی جیاوازی نێوان دەروێش و مەلا لەوەدا دەردەکەوێت کە دەروێشەکان ڕێباز و لێکدانەوەی جیاواز بۆ دەقە ئاینییەکان دەکەن و ئەوان خۆیان وەکو "تەریقەت"ێك دەناسێنن و ڕێگریش ناکەن لەوەی "تەریقەت"انی تر پەرە بە ڕێچکە و ڕێبازەکانی خۆیان بدەن. بەلام فێرکاری مەلاکان لە ئەنجامی دووبارەکردنەوەی هەمان ڕێنمایی ئاینییەکان بەبێ گۆڕانکاری سەدە لە دوای سەدە دەبێتە دۆگما و پاشتر بەرەو بە ئایدیۆلۆژیابوون

دەچێت. ئەمەش داوای یەکڕەنگی و یەکدەنگی و یەك هەڵوێستی دەکات. ئەم ڕەوشە ڕێك لە چیرۆکی "زیندووی مردوو"دا ڕەنگی داوەتەوە.

جا لە ئەنجامی ئەو دوو ڕوانین و هەڵوێستە جیاوازەی نێوان دەروێش و مەلادا چیرۆکەکە ئەوەمان بۆ دەخاتە ڕوو کە دەروێش هەمیشە بەدوای زیندوویێتی و ژیانپەروەریدا وێڵە. ئەوە مام دەروێشە کە داوا لە خەڵکانی ئەو شارە بێ ناونیشانەی کە مردووەکانیان نانێژن و لاشەی ئەوان هەموو شوێنێکی لێ داگیرکردوون و تەنانەت لەناو کۆڵان و مزگەوتەکانیشدا لاشەی مردوو وەکو لێژنەدار هەڵچنراون، دەکات کە هەتا زووە بچن مردووەکانیان بنێژن، ئەگینا ئەوانیش تووشی گرفتاری و دەردەداری و مەرگباری دەبن. کەچی مەلا و فەقێی ناو مزگەوتی ئەو شارە، مام دەروێش بە شێت و گەوج و نەزان و لەڕێ لادەر و گومڕاو دەدەنە قەڵەم. بەلای ئەوان تەنانەت یەك کەسیش لەم شارە نەمردووە و ئەوان زیندوون و تەنیا لەبەرئەوەی ناجووڵێنەوە نابێت ئەوان بە مردوو دابنرێن و هەرگیزیش نابێت بنێژرێن. کەواتە بەپێی ڕوانینی مام دەروێش بێت ژیان لە دەرەوەی کایەی مەلا و ڕوانینە مەرگدۆستانەکەیەتی، بەڵام بەگوێرەی ڕوانینی مەلا و فەقێکانی بێت ژیان و زیندوویێتی لە هەموو شوێنێکە و هیچ جۆرە مردن و مەرگێك بوونییان نییە و ئەوە مام دەروێش و کەسە گومڕاکانن کە دەیانەوێت ئەم بیرۆکە مەترسیدارانە بڵاوبکەنەوە. هەر ئەمەشە ئەو واتایەی لێدەکەوێتەوە کە مام دەروێش لە هەر کوێیەك بێت لەوێ ترپەی ژیان و زیندوویێتی دەکەوێتە لێدان و بەپێچەوانەشەوە، بەپێی چیرۆکەکە بێت، مەلا و دەروێش لە کوێ بن ئەژدیهای مەرگ و ڕوانینی مەرگاوی لەوێیە.

بۆ ئەوەی زیاتر بە بنج و بناوانی ئەم جیاوازییە دا بچین، وا باشە کەسایەتی هزری هەریەك لە دەروێش و مەلا لە چیرۆکەی محەرەم محەمەد ئەمین دا باشتر شی بکەینەوە. دەروێش وەك خۆی دەڵێت "وەك مارە" و تا سەر لە هیچ شوێنێك داناسەکنێ و هەمیشە لە گەشت و گەڕ دایە و بۆیەش زۆر وردبینانە و وردەکارانە لە ناخی خۆی و دیاردەکانی کۆمەڵگە و دەوروبەر ڕادەمێنێت. دوای ئەم ڕامانە پڕ سەرنج و مووقڵێشانەش ئەو هەوڵدەدات کە دەروبەر و دیاردەکان لەگەڵ وێژدان و هۆشی خۆی ئاشت بکاتەوە، نەك

بە پێچەوانەوە. واتە، دەروێش هەرچی لە ناخ و هۆشیدا جێگیر بووە لە ئەنجامی ئەو ئەزموونە بەرفراوانە نوێیەی لە کۆی ساڵانی تەمەنی پەیدای کردووە، هەوڵ دەدات لەسەر واقیع جێبەجێیان بکات و ئەگەر واقیعەکە لەگەڵ بیر و روانینی ئەو نەهاتەوە، ئەوا هەوڵی گۆڕینی ئەو واقیعە دەدات.

بەڵام مەلا هەمیشە دوای وەرگرتنی ئیجازەکەی حەز دەکات لە شوێنێك دابمەزرێت و ببێتە خاوەنی ماڵ و حاڵ و مزگەوتی خۆی و لەگەڵ دەسەڵاتی ناوچەکەی رێك دەکەوێت بۆ راپەڕاندنی ئیش و کارەکان بەپێی رێنماییەکانی ئەو زانستەی کە سەدان ساڵە لەناو کتێبەکاندا ماونەتەوە و هیچ گۆڕانکارییەکی ئەوتۆیان بەسەردا نەهاتووە. هەروەها زۆرجارانیش بۆ پاراستنی هاوسەنگی لەگەڵ دەسەڵاتی ناوچەیی شوێنی تێدا نیشتەجێبوونی، لەبەرامبەر پێدانی خانووێك و چەند سەر مەڕێك و مووچە و سەرقەڵەمانە و پاراستنی جەستەیی و مەعنەوییدا، ئەم مامۆستا بەڕێزانە زۆر راستییان ژێرلێو خستووە یان خۆیان لە ئاشکراکردنی راستییەکان لاداوە بۆ ئەوەی بەشێوەیەکی ئاسایی و یاسایی تەنها ژیانی خۆیان بۆ بچێتە سەر. بۆیە مەلا هەمیشە رۆڵی ئاشتکردنەوەی عەقڵ لەگەڵ واقیع دەکات و دەیەوێت مرۆڤەکان لەبەرامبەر راستییەکاندا خۆڕاگر بن و هەرچییەك لەگەڵ واقیعەکە نەگونجا ئەوان مێشکی خۆیانیان لەگەڵدا بگونجێنن. بەم پێیەش، مامۆستای ئایینی رۆڵی بڕیاردەر لەبەرامبەر دەوروبەر و دیاردەکان دەگێڕێت و ئەگەر دەوروبەر یان دیاردەکان لەگەڵ رێنماییەکانی ئایینی نەگونجان، مەلا هەوڵدەدات دەوروبەر و دیاردەکان لەگەڵ رێنماییەکان بگونجێنێت نەك بەپێچەوانەوە. ئەمەش دەقاودەق ئەو مەبەستەیە کە لە چیرۆکەکەدا بەرجەستە کراوە.

هەڵبەتە چ دەروێش و چ مەلاکان لەخۆوە نەبووە بوونەتە خاوەنی ئەو دوو جۆرە دنیابینیە جیاوازەی خۆیان، بەڵکو رۆژگار و دەوروبەر لەو جۆرە روانینە جیاوازانەیان بەرپرسیارە. بەڵام بەحوکمی ئەوەی مەلاکان لەو پەنجا ساڵەی رابردوودا (کە چیرۆکەکەی تێدا نووسراوە) کەسانی تێگەیشتووتر بووینە لەچاو کۆمەڵگاکانیان ، هەر هیچ نەبوایە دەبوو ئەوان پێشەنگی گۆڕانکاری و پێشخستنی دنیابینی نوێی ناو کۆمەڵگەکەیان بووان.

هەربۆیەشە لە چیرۆکی "زیندووی مردوو"دا ئەوە مام (دەروێش)ە کە دەیەوێت مێشکی خەڵکەکە بکاتەوە و خەڵکەکە لەو بۆگەنیاتییەی کە ناو هەناوی کۆمەڵگەکە دادەرزێنێت رزگار بکات. مام (دەروێش)ە کە پرسیار ئاراستەی فەقێیەکە دەکات و پێیدەڵێت:

- ئەبینم، لە شارەکەتانا لاشەی مردوو لەملا و لەلاوە فڕێدراوە،
بۆگەنیان کردووە، کەچی کەس گوێ ناداتێ! بۆچی وەکو شارانی تر
گۆڕهەڵکەن گۆڕیان بۆ هەڵناکەنێ و نایان کەن بە ژێر خاکەوە؟*

کابرای فەقێ کە ئەویش هێمای شاگردانی ئەوەی نوێی دەسەڵاتی ئایینیە لەجیاتی ئەوەی بیر لەو قسانەی مام دەروێش بکاتەوە و ژیرانە هەڵیان بسەنگێنێت و بزانێت راستن یان نا یەکسەر سیخوڕی بۆ مەلاکەی دەکات و سەرەنجام خەڵك لە مام دەروێش، کە هێمای گۆڕانکارییە لە کۆمەڵگە چەقبەستووە بێ گۆڕانکارییەکەدا، گاڵ دەدەن و راوەدووی دەنێن و شاربەدەری دەکەن. ئەم چیرۆکە ئەگەر شتێکمان بۆ روون بکاتەوە، ئەوەمان پێدەڵێت دەسەڵاتەکان چ ئایینی بن و چ کۆمەڵایەتی و چ سیاسی حەز لە هیچ جۆرە گۆڕانکارییەك ناکەن و هەرکەسێکیش بیەوێت تۆزقاڵێك گۆڕانکاری لە کۆمەڵگەدا بهێنێتە کایەوە چارەنووسی یان هەڵاتن یان فەوتان و لەناوچوونە.

ئەم دوو جۆرە هەڵوێستە پێچەوانەیەی مام دەروێش و مەلا هیچ سەیر نییە لەلای کەسانێك کە بەباشی لە رۆڵی ئایین وەك "رزگارکەر" و بەکارهێنانی ئایین "وەك ئامرازێکی ملکەچکەر" بگەن. چونکە مەلا لەم چیرۆکەدا لەگەڵ دەسەڵاتی سیاسی ئەو کۆمەڵگەیە دەستی تێکەڵ کردووە، بۆیە ئەو ئایین بە رووە جوانە مرۆڤانەکەی بەکارناهێنێت، بەڵکو کردوویەتی بە داردەستێك بۆ شۆردنەوەی مێشکی خەڵکی و هێشتنەوەی کۆمەڵگە لەو رەوشە بۆگەنەی کە لە چیرۆکەکە ئاماژەی پێدراوە. ئەوەش بەروونی دیارە کە بەرژەوەندی ئەو لەوەدایە کە هیچ جۆرە گۆڕانکارییەك لەم کۆمەڵگەیە

---

* محەرەم محەمەد ئەمین ، کۆبەرهەمە ئەدەبی و سیاسی و فەلسەفییەکانی ، ل ٦٠

روونەدات و ئەگەر گەندەڵی و کەم و کوڕیش هەبن پێویستە لە ڕێگای مێشك شۆردنەوەی خەڵکی پەردەپۆش بکرێن. جا چونکە مەلاکە خاوەنی هەموو سامان و دەسەڵاتێکی دنیاییە، هەموو جۆرە گۆڕانکارییەك بۆ ئەو مایەی مەترسییە. هەر بۆیەش لای ئەو مردووەکان باشتر و پیرۆزتر و خۆشەویستترن لە زیندووەکان. هەرچەندەش بۆنی بۆگەنیان دنیاش هێڕ بکات، ئەو نکۆڵی لەوە دەکات کە ئەوانە مردوو بن یان بۆنی بۆگەنیان لێوە دەرچێت و بۆیەش لاشەی مردووەکانی وەك لێژنەدار لەناو مزگەوت هەڵچنیووە.

بەپێچەوانەشەوە، چونکە مام دەروێش لەو کۆمەڵگەیەدا خاوەنی هیچ شتێك نییە و بە تەمای هیچ جۆرە سامانێکی دنیاییش نییە، بۆیە ئەو نە هەستەکانی مردوون و نە وێژدانیشی. ئەو سەر بۆ هیچ دەسەڵاتێکی دنیایی شۆڕ ناکات و بەرفرمانی هیچ دەسەڵاتێك نابێت جگە لە دەسەڵاتی عەقڵ و هۆش. ئەو ئازایانە بەرەنگاری روانینی باوی کۆمەڵگە بۆگەنەکەی دەبێتەوە بۆ هێنانەکایەوەی گۆڕانکارییەکی بنەڕەتی.

بەڵام وەك لە مێژوودا باو بووە و باوە ، هەمیشە کەسانی رۆشنبیر و نوێخواز و گۆڕانکار لە کۆمەڵگەکەیان یان شاربەدەرکراو یان ریسواکراون و یانیش لەناوبراون. کەچی دوای ماوەیەکی دووروودرێژ لەبەر رۆشنایی تیشکی بیرەکانی ئەواندا کۆمەڵگە پێداچوونەوەی بەخوێدا کردووە و کەسانی گەندەڵکار زوو یان درەنگ لادراون و پەیکەری ئەمریش بۆ ئەو رووناکبیرانە لە دڵ و مێشك و دیدی نەوەکانی داهاتوودا نەخشی گرتووە.

**سێیەم: سەرەنجام**

لە کۆتاییدا بەو ئەنجامە دەگەین کە (محەرەم محەمەد ئەمین)ی نووسەری ئەم چیرۆکە هێمایییە، زۆر بەسەیری دەستنیشانی هۆکار و دەرکەوتەکانی ئەو دوو جۆرە دنیابینییە جیاواز و پێچەوانەیەی دوو کەسایەتی ئایینی کردووە. یەکێکیان کە مام دەروێشە تا سەرئێسقان یاخی و شۆڕشگێڕ و ناملکەچ بۆ هیچ دەسەڵاتێکی دنیایی و هەمیشە وێڵی دوای دۆزینەوەی راستی. هەربۆیەشە لە چیرۆکەکەدا ئەو دەبێتە

هێمای زیندوویێتی و ژیاندۆستی. کەچی ئەویتریان کە مەلا و سوختە و فەقێکانیەتی تا سەرئێستان دەسەڵاتخواز و بەرژەوەندخواز و پەردەپۆشکەری راستی و بەلارێدابەرن. چیرۆکنووسیش زۆر وریایانە ئەوانی کردۆتە هێمای مردن و مەرگدۆستی. دنیابینی ئەم دوو دژانەیە لە ناوەراستی چیرۆکەکەوە تا کۆتاییەکەی پاڵ بە رووداوەکانەوە دەنێت. هەر ئەم دوو روانینینە دژبەیەکەشە کە وا دەکات ئەم چیرۆکە تا رۆژگاری ئەمڕۆش بە زیندوویی بمێنێتەوە.

**هەولێر: ٢٠١١/٤/١٠**

# زۆرانبازی نێوان برسێتی و ئابڕوو لە چیرۆکی (مام هۆمەر)ی محەڕەم محەممەد ئەمین

د. ئازاد حەمە شەریف

## یەکەم: پێشەکی

چیرۆکنووسی بەتوانا و خاوەن هەستی بەرزی مرۆڤایەتی (محەڕەم محەمەد ئەمین) پتر لە نیو سەدە لەمەوبەر واتە لە ساڵی (١٩٥٤)دا زۆر هونەرییانە زۆرانبازی نێوان برسێتی و ئابڕووی کردۆتە بابەتی چیرۆکێکی خۆی بەناونیشانی (مام هۆمەر). ئەو کێشەیەی ٥٦ ساڵ لەمەوبەر ئەم باسی لێوە کردووە کێشەیەکی قووڵی جیاوازی چینایەتییە و تا ئێستاش گۆڕانگارییەکی ئەوتۆی بەسەردا نەهاتووە و هێشتا لە زۆر شوێندا کێشەکە زیندووە و چینی هەژاری کۆمەڵگە بەدەستییەوە دەناڵێنن.

ئەگەر ئەوسا پاساوێك بۆ ئەم جۆرە زۆرانبازییە هەبوو بێت کە دوژمنانی داگیرکار هۆکاری ئەم جۆرە کێشانە بووبن، ئەدی ئێستا پاساو چییە؟ خۆ ئێستا دوژمنانی داگیرکەر دەمێکە لە گۆڕەپانەکەدا نەماون؟ ئایا هۆی مانەوەی ئەم کێشانە چیین؟ ئەرێ بۆچی تا ئێستا کێشەکان بەتەواوی چارەسەر نەکراون؟ ئایا عەقڵییەتی خۆپەرستانەی چینێکی کۆمەڵگە بەرژەوەندی لەوەدایە کە کێشەکان دەیە دوای دەیە هەر وەکو خۆی بێننەوە یان هۆی تر لەپشت ئەم ناداپەروەری و نایەکسانییەوەیە کە (محەڕەم محەمەد ئەمین) ئەوسا لە چیرۆکەکەی پەنجەی لەسەر داناوە و تا ئێستاش هەر جەستەی چینی هەژاری پێ دادەڕزێت؟ ئەم لێکۆڵینەوە پەنجە دەخاتە سەر هۆکار و ئەنجام و دەرهاویشتە و دیاردە جۆراوجۆرەکانی کۆمەڵگای ئەوسا و دەشبێتە ئاوێنەیەکی باڵانمای کێشەکانی ڕۆژگاری ئەمڕۆش.

**دووەم: هۆکارەکانی زۆرانبازی**

هەر لە یەکەم رستەی چیرۆکەکەوە چیرۆکنووس زۆر راستگۆیانە پەنجە لەسەر برینەکان دادەنێت و هۆکاری ئەو زۆرانبازییە کە دابەشکردنی نادادپەروەرانەی سامانە لە نێوان تاکەکانی کۆمەڵگە بەشێوەیەکی هێمایاوی دەخاتەڕوو. کۆختە لە قوڕدروستکراوەکەی (مام هۆمەر) و خێزانە هەژارەکەی کە ژنێك و دوو منداڵی ساوا و خوی ژیانێکی هەژارانەی مەرگەساتاوی تێدا بەسەر دەبەن لە پەنای کۆشکەکەی (بایزبەگ)دا جێگیر کردووە.

ئەم جۆرە وێناکردنە لە یەکەم بڕگەی چیرۆکەکەدا کەشوبایەیەکی نادادپەروەرانە و پڕ جیاوازی بە گوێی نەخەوتووی خوێنەردا دەچرپێنێت. هەر لە یەکەم ساتی وەسفکردنی کۆختەکە و دیمەنی (مام هۆمەر)ی ماندوو و ڕەتاو و پشتکۆماوی ژێرباری کۆڵکیشی و نەبوونی نانی شەوانە بۆ خۆی و منداڵە بچکۆڵە برسییە ساواکانییەوە، بە بەراورد لەگەڵ باخچە پانوپۆڕ و خواردنە چەور و بەتام و زۆر و زەبەند و ماڵە پڕ بەزم و رەزم و ناهەنگاویەکەی (بایز بەگ)دا، مرۆڤ هەست بەوە دەکات کە زۆرانبازییەکی زۆر بەتێن لە نێوان دوو چینەکەی کۆمەڵگەدا (چینی ئاغا و بەگەکان و چینی هەژار و دەستکورتەکاندا) هەیە. لایەنێکیان هەر هیچی نییە پێی بژیت تا مانەوەی نەوەی داهاتوو (کە منداڵە ساوا برسییەکانی مام هۆمەرن) بەزیندوویی لە ژیاندا دەستەبەر بکات و لایەنەکەی تر (بایزبەگ)ەکان هەموو شتێکیان بە زیادەوە هەیە و ئامادەش نین بە خێر، بە پیاوەتی، یان لەبەر هەستی مرۆڤایەتی یارمەتی لایەنەکەی تر بدەن.

هەرچەندەی لە خوێندنەوەی لاپەڕەکانی چیرۆکەکە بەرەو پێش دەڕۆین، ئەم کێشە و زۆرانبازییە بەرە بەرە رووەو هەوراز دەچێت. تا دەگاتە ترۆپك کە دزینی قاپە خواردنێکە لەلایەن (مام هۆمەر) و گیرانییەتی لەلایەن پاسەوانە دڵڕەقەکانی ماڵی بایزبەگ و رەوانەکردنی (مام هۆمەر) بۆ پۆلیسخانە و دانی بە دادگا و دەرچوونی فەرمانی دادگایی بە بەندکردنی بۆ ماوەی سێ مانگ. ئەمەش بەتەواوی لە پەلوپۆخستنی ئەو خێزانە هەژارە لەبرسامردووەیە و ناچارکردنی (خەجە)ی ژنی (مام هۆمەر)ە بۆ گرتنەبەری رێگای هەڵە لەگەڵ کۆمەڵە گەنجێکی پارەداری هەستمردوودا لە پێناو پەیداکردنی پارووە نانێك بۆ خۆی و منداڵە ساواکانی.

**سێیەم: سەرەنجامەکانی زۆرانبازی**

هەرلەسەرەتاوە چارەنووسی خێزانی هەژار و برسی (مام هۆمەر) وا دیاریکراوە کە بە کلۆلی لە پەنا مالی تێروتەسەل و دەولەمەندی (بایزبەگ)دا ژیان بەرێتەسەر. بەلام (مام هۆمەر) بەم پیری و بێ هێزیەشیەوە کۆل نادات و لە بەیانییەوە تا ئێوارە کۆلکێشی دەکات و ژنەکەشی نانکردن و جلشۆری بۆ مالە دەولەمەندان. هەربۆیەش بە هیچ جۆرێك نەخۆی و نەخێزانەکەی مرۆڤی خراپەکار و بێ کەرامەت نین. (مام هۆمەر) و (خەجە)ی خێزانی ئەوسا تووشی هەلدێر دێن کاتێك هیچ مەودایەك نە بۆ ژیانی خۆیان و نە بۆ دوو کۆرپە ساواکانیان (قالە و حەمە) دەمێنێتەوە. جا لە کۆمەلگەیەکی دلڕەقی پڕچینایەتی ئەوسا و ئێستادا مرۆڤی هەژار جگە لە هێزی جەستەیی، یان چێژی جەستەیی خۆی هیچی تری نییە بە دەسەلاتداران و پارەدارەکانی بفرۆشێت.

سەرەتا (مام هۆمەر) ئامادە بوو هێزی جەستەی خۆی وەکو کۆلکێشێك لە بازاڕی کڕین و فرۆشتندا لە بەیانییەوە تا ئێوارە بۆ پارووە نانێك بۆ خۆی و مندالە برسییەکانی بفرۆشێت. بەلام کە پیر و بێتوانا دەبێت ، دەولەمەند و پارەداران ئامادەنین چیتر هێزی جەستەی تین تیانەماو و لاوازی (مام هۆمەر) بکڕن ، لەکاتێکدا جەستەی کۆلکێشە گەنجەکانی تر لە مەیداندا بێت.

بۆیە ئەو ڕۆژە نەگبەتییەی کە (مام هۆمەر) بۆ ئێوارەکەی تووشی چارەنووسە ڕەشەکەی خۆی دێت کە لە بازاڕ ڕوو لە هەر دەولەمەندێك دەکات بۆ بەکرێگرتنی هێزی جەستە تین تیانەماو و لاوازەکەی ئەو و کۆلکێشی پێکردنی، هیچ کەس ئامادە نییە کاری پێبکات. تەنانەت یەکێك لەو بەگ و ئەفەندییە بەفیزە دلڕەقانەی بازاڕ زللەیەکی زۆر توند لە بناگوێی دەکوتێت و بە جنێو و قسەی سووك و ڕیسوایی و هەناسەساردییەوە بەڕێی دەکات.

ئێوارە لەڕێگای بەرەو مالبوونەوە دلی خۆی بەوە دەداتەوە کە لەوانەیە ئەمرۆ (خەجە)ی خێزانی بە جلشۆرین بۆ مالی (جوامێرئاغا) شتێکی پەیدا کردبێت و سکی برسی خۆی و مندالە بەسەزمانەکانیان (قالە و حەمە) پێ تێر بکەن. بەلام کاتێك بەدبەختی ڕوو لە مرۆڤ دەکات شێکسپیر گۆتەنی :"خۆشی بە تنۆك و بەدبەختی بە قەنتار دێت." (خەجە)ی خێزانیشی ئەو ڕۆژە هەر هیچی دەستنەکەوتووە چونکە مالی

(جوامێر ئاغا) ئەو رۆژە بە کۆستی خۆیان دا کەوتبوون و هەواڵی مردنی دایکی ژنەکەی ئاغا واتە (خەسووی جوامێرئاغا) یان بۆ هاتبوو .

کەواتە چ (مام هۆمەر) و چ (خەجە)ی خێزانی لەسەرەتاوە مرۆڤی ئیشکەری نابروومەند بوون و تەنها دواتر نەبوونی ئیش و پێویستی و نایەکسانی کۆمەڵایەتییە ئەوان بەرەو باوەشی هەڵەکردن پاڵ ناوە. ئەگینا ئەوانیش وەکو هەر کەسێکی تر حەزیان لەوە بووە بە سەربڵندی و خۆشی وەکو هەر کەسێکی تر کار بکەن و ژیان بگوزەرێنن.

ئەم جۆرە وێنەکێشانەی چیرۆکنووس بۆ کەسایەتی (مام هۆمەر) و (خەجە)ی خێزانی پێش داخزانی هەردووکیان بۆ ناو زەلکاوی هەڵە، وردی و کارامەیی و دووربینی چیرۆکنووس دەخاتە روو. چیرۆکنووس بەم جۆرە وێنەکێشانەی سەرەتای چیرۆکەکەی دەیەوێت رێگا لەو رەخنەگرە بۆرژوازیانە بگرێت کە بۆ سپیکردنەوەی رووی خۆیان و بە بێتاوان نیشاندانی چینە ستەمکارانەکەیان وا دەربخەن کە کۆمەڵگەی هەژارنشین هەر لە ئەزەلەوە جێگای تاوان و خراپەکارییە، کە پێچەوانەکەی ئەمە زۆر راسترە. چونکە بەگشتی هیچ کەسێك، یان چینێك لە خۆوە تاوانبار یان خراپەکار نییە، بەڵکو ئەوە دەسەڵاتدارانن (جا چ خاوەن دەسەڵاتی ئابووری، یان کۆمەڵایەتی بن) لە رێگای چەوساندنەوەی کەسانی بێدەسەڵات و پەیرەویکردنی نادادپەروەری کۆمەڵایەتییەوە پاڵ بە هەژارانەوە دەنێن و ناچاریان دەکەن ببنە تاوانبار و کەسانی رووخاو.

تەنانەت کاتێك (مام هۆمەر) هۆکاری دزینی ئەو قاپە خواردنە بۆ هەموو لایەك روونیش دەکاتەوە و دەڵێت کە لە تاو برسێتی منداڵەکانی (قالە و حەمە) ئەو کارەی کردووە و گەلێ جاری تریش چۆتە بەردەرگایماڵی (بایزبەگ) بۆ ئەوەی بەزەیی بە خۆی و منداڵە برسییەکانی دابێتەوە، بەڵام ئەو دەریکردووە و هیچی پێنەداوە. بۆیە ئەو بەناچاری قاپە خواردنەکەی دزیووە ، نە (بایزبەگ) و نە پۆلیسەکان و نە (دادپرس)یش بەزەییان بەو کۆڵکێشە هەژارە نایەتەوە.

(بایزبەگ) و (پۆلیس) و (دادپرس) هێمای سێکوچکەی دەسەڵاتن لەو چیرۆکەدا و بە هەرسێکیشیان داکۆکی لە چەوسێنەران و ستەم لە زۆرلێکراوان دەکەن. هەر ئەو

سێیەشن کە ئەو خێزانە بەسەزمانە بەرەو هەڵدێر پاڵ دەنێن. تاقە کەسێك کە بـەزەیی بە هەژاراندا بێتەوە تەنیا چینی هەژار خۆیەتی. پێش ئەوەی (مام هۆمـەر) دادگـایی بکرێت، کاتێك (ئەحەی حەماڵ) بەلای خێزانـی (مـام هۆمـەر) تێدەپـەڕێت و ئـەوان دەبینێت وا بە کز و کڵـۆڵی لەبـەر دەرگـای سـەرا دانیـشتوون و منداڵـەکانی (مـام هۆمەر) لە دەست برسێتی گریە و کڕووزەیانە، هەستی مرۆڤانەی وایلێدەکات سەرەڕای هەژاری و نەبوونیشی پەنجا فلس بداتە ئەو خێزانە هەژارە.

بە بەراوردکردن لەگەڵ (بایزبەگ)ەکان، (ئەحەی حـەمال) کەسـێکی یـەگجار نـەدار و دەستکورتە، بەڵام چونکە تەنها هەژار لە زمانی هەژار دەگات، هەستی مرۆڤانەی (ئەحەی حەماڵ) زۆر هەڵکشاوترە لە کەسـانی هەسـتمردووی نـاو دام و دەزگـا دەسـەڵاتدارەکانی ئەوسا. هەربۆیەشە هەژاران تەنیا پێویستە چاوەڕوانی بەزەیی و کۆمەك لە هەژاران بکەن. ئەگینا دەوڵەمەند و پارەداران بەهیچ جۆرێك بەبێ مەبەست یارمەتی هـەژاران نـادەن وەك دواتر لە مەسەلەی (خەجە) و کوڕە دەوڵەمەندەکان لەم چیرۆکەدا دەردەکەوێت.

هەستی چینایەتی هەژاران هەمیشە وایان لێدەکات خۆیان بە خـاوەن مـاف بـزانن و چەوسێنەران بە ستەمکار و زەوتکەری مان و ژیانیـان. کاتێـك (مـام هۆمـەر) لەلایـەن دادپرسەوە بە تاوانی دزی بڕیاری سێ مانگ زیندانی بۆ دەبڕدرێتەوە، هـاواری نـارەزایی لێوە هەڵدەسێت کە ئەمەش گوزارشت لە زمانی ناخی (مام هۆمەر)ەکانی دنیا دەکات:

- هـەوڵ بـدەم بـە شـارەقی ناوچـەوان نـانم بـۆ پەیـداناکرێ بـۆ منداڵـەکانم، لەودیویشمانەوە چێشت لەبەر سەگیش بێنێتەوە.. بەخوایـشتی خۆشـیان نەمـدەنێ! لەگەڵ ئەوەشا کە بایزبەگ بەبێ رەنج پەیای ئەکا.. بە رەنجی چـەند هـەڤاڵێکی مـن پەیای ئەکا..ئەی چی بکەم جەنابی دادپرس!؟ قوڕی کوێ بکـەم بەسـەرما؟ بـۆ مـن ئەگەر قاپێ چێشت بەرم لەو چێشتەی کە بەڕەنجی رەش و رووتی گەلێ کەسانی وەکو من هاتۆتە بەرهەم بە دز ئەدرێمە قەڵەم؟ ئەی بایزبەگ بۆ بە دز نادرێتـە قەڵـەم کـە بەری رەنجی هەزاران هەژار بەزۆرەملی ئەخوا؟ (محەرەم محەمـەد ئـەمین ، کۆبەرهەمـە ئەدەبی و سیاسی و فەلسەفییەکان ، چیرۆکی "مام هۆمەر" لاپەرە : ٣٣).

جا لێرەدا خوێنەر ئەم پرسیارە لە خۆی و دادپرسەکان دەکات: "ئەگەر دزینی قاپێك خواردن سزاکەی سێ مانگ زیندانی بێت، ئەدی ئەگەر یەکسانی کۆمەڵایەتی هەبێت دەبێ (بایزبەگ) و ئاغاکانی وەك ئەو کە سەدان ساڵە دزی لە (مام هۆمەر) و هەژارانی وەکو ئەو دەکەن دەبێت چەند بێت؟ ئایا ئەگەر یاسایەکی وا لە سەرانسەری دنیادا پەیڕەو بکرێت، دەبێت چەند زیندانی گەورە بەشی ئەو هەموو تاوانکارانە بکات؟"

**چوارەم: خێزانێك لەبەردەم رەشەبای مەرگ دا**

پاش گیرانی (مام هۆمەر)، چارەنووسی ئەو دوو منداڵە بچکۆلەیە: (قالە و حەمە) و (خەجە)ی دایکیان بەخێرایی بەرەو هەڵدێر دەچێت کاتێك برسێتی بەتەواوی سەر لەناو هەناویان دەنێت. سەرەتا (خەجە) هەوڵدەدات لە رێگای لە دەرگادانی بەزەیی خەڵکییەوە ئیشێك بۆ خۆی پەیدا بکات و لەم رێگا رەوایەوە بژێوی خۆیان مسۆگەر بکات. بەڵام ئەمە دادی نادات، چونکە هەمیشە لە کۆمەڵگەی چینایەتیدا ئەوەندەی دڵرەقی باڵادەستە نیو ئەوەندە بەزەیی و دڵنەرمی باڵادەست نابێت.

دوای کوتانی دەرگای بەزەیی پێنج ماڵ، کەس ئیش بە (خەجە) نادات و هەموو ئەوەی لە رێگای بەزەییەوە پەیدای دەکات کەمێك نان و شەکر و چایە. ئەو خێرەش کەیبانووی ماڵێك پێی دەکات و پێیشی دەڵێت: "...بەڵام مێردەکەم بزانێ هەر سێ تەلاقم ئەدا.. لەبەرئەوە جارێکی تر مەیە بێرەیا." (محەرەم محەمەد ئەمین ، هەمان سەرچاوە ،لاپەرە : ٣٥) ئەو کەیبانووە دڵنەرمەش زۆر لەوانەیە بە خۆیشی لە چینی هەژار بوو بێت و کەوتبێتە ماڵە دەوڵەمەندێك ئەگینا سەختە دەوڵەمەند بەزەیی بە هەژار بێتەوە.

سەرەنجام کە (خەجە) لە هەموو بەزەییەکی ماڵە دەوڵەمەندەکان نائومێد دەبێت، رووە و سواڵکردن لە کوچە و کۆڵان و چایخانەی سەر شەقامان مل دەنێت بۆ ئەوەی هەرچۆنێك بێت خۆی و منداڵەکانی تا ماوەی سێ مانگی تر کە کاتی بەربوونی (مام هۆمەر)ە بەزیندوویتی بێننەوە. ئا لەوێدایە کە رووبەرووی گەورەترین مەترسی دەبێتەوە کە چارەنووسی خۆی و (مام هۆمەر) و منداڵەکانیش دەخاتە مەترسییەوە.

لەوێدا داوای سوالّ لە دوو گەنجی ناو چایخانەیەك دەكات. ئەو دوو گەنجە رۆڵەی دەوڵەمەندەكانی شارن و لەبەرئەوەی سكییان بە خواردنی رەنجی هەژاران تێرە و لە هیچیان كەم نییە ئەوە نەبێت كە ژنێكی وا هەژار و لێقەوماو لەخشتەبەرن. (نەریمان) و (رۆستەم) بەئاشكرا بەو ژنە بەدبەختە دەڵێن ئەگەر ئەو ئامادەبێت لە ماڵەوە لەگەڵیان دابێت، ئەوان ئامادەن هەرچییەكی ئەو داوای بكات پێی بدەن.

كاردانەوەی سەرەتایی ژنە هەژار و داماوەكەی (مام هۆمەر)ی ناو زیندان تفبارانكردنی دوو گەنجەكەیە. بۆیە ئەگەرچی ئەو ژنێكی نەخوێندەواریشە هەر زوو ئەویش لەو راستییە دەگات كە هەمیشە چینی هەژاران قوربانی دەستی چینی دەوڵەمەند و ستەمكارەكانی كۆمەڵگەن:

**ئەمە یەكەم جار بوو بۆی ئاشكرابێ كە لەژیانا...ئەم جۆرە درندە و جانەوەرانەی تیابێ.. لە پێشا هەر دەردەسەری و مەینەتیەكی ئەدی گوێی نەئەدایە..چونكە لە منالّیەوە پێی گۆشكرابوو، بەلاّم هیچ لەمەی ئیمرۆ نەئەچوو..وە كە ئەمەی دی شەكا شەكای بە گیانی خست، دەروونی هێنایە جۆش، بیری لە ئێستا و رابردوو ئەكردەوە.. مێردەكەی رۆژ بەبێ دەسەلاّتی خۆی ئیشی دەست نەكەوت، ویستی لە ماڵی بایزبەگ قاپێ چێشت بهێنێ بۆ منالّەكانی.. كەچی خرایە بەندیخانەوە.. (محەرەم محەمەد ئەمین، هەمان سەرچاوە، لاپەرە: ٣٩).**

لە سەرەتاوە (خەجە) تووشی هێدمە دەبێت كە ئەو گەنجانە داوای شتێكی وای لێدەكەن. ئەمەش ئەگەر شتێكمان بۆ دەربخات ئەوەمان بۆ روون دەكاتەوە كە ئەو ژنە مرۆڤێكی یەكجار ئابڕوومەندە و ناچاری تووشی هەڵەی دەكات نەك ویستی خۆی ، وەك چۆن ناچاری مێردەكەی تووشی هەڵە كرد.

وادیارە پێش ئێستا ئەو ژنە داماوە بە قسەكانی كۆمەڵگە مێشكی شۆردرابۆوە، بەلاّم دوابەدوای بەقووڵی بیركردنەوە لە رابردوو و ئێستا و داهاتووی خێزانەكەی ، بەتەواوی و بڕواوە دەگاتە هۆشیارییەكی بەربلاّو دەربارەی چینەكەی خۆی و چینەكانی تری كۆمەڵگە:

**ئەویش سەری كرد بە هەر ماڵێكدا ئیش بدۆزێتەوە و منداڵەكانی پێ بەخێو بكات..بەلاّم دەركرا..لەپاشا دەستی دایە سوالكردن..ئەمیش دەری نەهێنا..ئێستاش داوای**

لیَ ئەکەن ببیَ بە...موچڕکەیەکی بەلەشا هات..تۆ بڵێی ئەمە چارەنووسی خوابیَ؟! جاران بڕوام وابوو کە هەژاری و دەوڵەمەندی و دەردەسەری و کامەرانی..هەرچی قەزا و بەڵایەك تووشی خەلکی ئەبیَ هەمووی خوا بڕیویەتەوە..بەڵام ئێستا نەء، خوا مرۆڤی هەموو وەکو یەك دروست کردووە..خوا هۆی ژیانی وەکو یەك دابەشکردووە بەسەر خەلکیدا..هەموو کەسێك ئەبیَ بە ئەندازەی ڕەنجی خۆی بخوا..خوا ناهەقی ناکا، ناهەقی و زۆرداری هەمووی لە مرۆڤەوەیە، ئەوەی بڵیَ هەژاری کاری خوایە، کافرە..دوژمنی خوایە.. (محەرەم محەمەد ئەمین ، هەمان سەرچاوە، لاپەڕە: ٣٩).

بەپێی ئەو قسانەی سەرەوە، ئەگەرچی (خەجە) گەیشتۆتە پلەیەکی یەگجار بەرز لە هۆشیاری کۆمەلایەتی و چاك دەزانێت کە هەرچی بەدبەختی و کوێردەوەری هەژارانە دەرهاویشتە و دەرەنجامی چەوساندنەوەی بیَ بەزەییانەی ئەوانە لەلایەن دەوڵەمەند و ئاغاکانەوە. کەچی بۆ رزگارکردنی هەردوو منداڵە ساواکەی (کە هێمای کوڕە هەژارانی نەوەی داهاتوون) بۆ ئەوەی لە برسان نەمرن ، ئەو کە دەبینێت پارەداران نە ئامادەن خێری پیَ بکەن و نە کاریشی پیَ بدەن، بەناچاری مل بۆ خواست و ویستی کوڕە دەوڵەمەندەکان دەدات تا بەم ڕێگایە منداڵە بەسەزمانەکانی لە دێوەزمەی مردن لە برسان رزگار بکات. ئەمەش ئەوپەڕی قوربانیدانی دایکە بۆ منداڵ.

هەڵبەتە هەروەکو منداڵە ساواکانی (مام هۆمەر و خەجە)ی بەدبەخت هێمای کوڕە هەژارانی نەوەی داهاتوون، (نەریمان) و (رۆستەم)ی چەوسێنەری (خەجە)ی ژنە هەژار، ئەوانیش هێمای کوڕە پارەدارەکانی نەوەی داهاتوون. کەواتە وەك چۆن هەژاران لە رابردوودا لەلایەن پارەدارانەوە چەوسێنراونەتەوە، ئەوەی داهاتوودا مرۆڤە هەژارەکانیش لە داهاتوودا هەر هەمان چارەنووس چاوەڕوانییانە. ئەو چارەنووسە ئەگەر خراپتر نەبێت بەهیچ جۆرێك باشتر نابێت.

### پێنجەم: دواقۆناغی زۆرانبازی

دوای مانەوە بۆ ماوەی سیَ مانگ لە زیندان، بە بەربوونی(مام هۆمەر) چارەنووسی ئەو خێزانە هەژارە بەرەو خۆشی و کامەرانی ناڕوات. بەپێچەوانەوە، هەتادیَ لە

کارەسات وماڵوێرانی نزیکتر دەبێتەوە. چونکە دوای بەربوونی (مام هۆمەر) ژنەکەی تووشی گرفتی دەروونی و ئازاری وێژدان دێت و بڕیار دەدات بەیەگجاری واز لە هەڵەکانی پێشووی بهێنێت و راستەڕێی ژیانێکی سەربەرزانە بگرێتەبەر. ئەگەر تا ئێستا نەبوونی و ناچاری راوەدووی نابێت بەرەو زەلکاوی دەوڵەمەندان، خۆ ئێستا (مام هۆمەر) بەربووە و ئامادە نییە چیتر لەو زەلکاوەدا مەلە بکات. بۆیەش دەیەوێت سەرلەنوێ ژیانێکی هەژارانەی سەربەرز نەك دەوڵەمەندانەی پڕ ریسوایی بەسەر بەرێت.

بەڵام وەك چۆن پێشتر دەوڵەمەندان و پارەداران ژیانییان لە هەژاران تێکداوە و لێیانیان کردۆتە دۆزەخ، هەر هەمان شەو، لەناو باوەشی شیرین خەودا لە تاریکییەوە یەکێك لەم گەنجانە بەسەرخۆشییەوە خۆی هەڵدەکوتێتە ناوماڵی (مام هۆمەر) و داوای کاری جاران لە ژنەکەی دەکات. هەرچەندە ئەو ژنە بەدبەختە دەیەوێت ئەو بەڵایە لە کۆڵ خۆی و خێزانەکەی بکاتەوە، هیچی پێ ناکرێت.

کاتێك (مام هۆمەر)ی تازەخەوتوو واگادێت دەبینێت وادەستی ژنەکەی بەدەست گەنجێکەوەیە. بەپەلە هەوڵ دەدات ژنەکەی رزگار بکات، بەڵام کەی پیرە پیاوێکی لەبرسامردووی هەژاری تازە لەزیندان دەرهاتوو دەرەقەتی گەنجێکی تێروپڕی کەتە دێت؟ سەرەنجام گەنجەکە بەکێشانی کۆڵەمستێك بە قەبرغەی بێهێز و لاوازی (مام هۆمەر)دا وادەکات (مام هۆمەر)ی بەسەزمان نووسکەی نەیەت و لەگەڵ زەوی بۆ یەگجاری تەختی دەکات.

(خەجە)ی مەینەت دیدە و بێکەس و خەفەتباریش کە دەبینێت مێردە بەدبەختە خێرلەخۆنەدیووەکەی لەسەرینی هەڵەکانی ئەوەوە تووشی ئەو کارەساتەی ماڵوێرانکەرە هاتووە (ئەگەرچی ئەو بەخۆیشی قوربانی دەستی چەوسێنەرەکانە)، لەهەژمەتان وەزگ دەدات و لەتاو ئەو کارەساتە لە ژوور سەری مێردە مردووەکەیدا قیژەیەکی جەرگبڕ دەکات و بەیەگجاری سەردەنێتەوە.

بەبڕوای من، مردنی یەکسەرەی (مام هۆمەر) تاقە شەوێك دوای بەربوونی لە زیندان تارادەیەکی زۆر لەلایەن خوێنەرەوە کارێکی رێ تێچوو و جێگای باوەڕە، بەڵام ئەو مردنە کتوپڕەی (خەجە) بەم دەستوبردی و خێرایی و شاراوەیی و کەس

پێنەزانییەوە شتێکی زۆر نائاسایی و ناسروشتییە و تاقە خاڵێکی لاوازە لـە جەسـتەی ئەم چیرۆکە پڕمانا و بایەخدارەدا.

لە کۆتایی چیرۆکەکەدا خوێنەری زیرەك بێگومان ئەو پرسیارە لە خۆی دەکـات: کـێ تاوانبارە و کێیش بـێ تـاوان؟ ئایـا بەڕاسـتی چـینی چەوسـاوە تاوانبـارن، یـان چـینی چەوسێنەر؟ چونکە وەك لەم چیرۆکەدا بینیمان هەرچی تاوان و خراپەکارییە سەرچاوەکەی لە کۆشك و تەلاری دەوڵەمەندانەوەیە و هەر ئەوانن کـە بـۆ مەبەسـتی تایبـەتی خۆیـان چارەنووسی مام هۆمەر و ژنەکەی و هەزارانی وەکو ئەو دەفەوتێنن. هـەر ئەوانیـشن لـە تاریکایی شەودا پلانە نهێنییەکانیان دژ بە هەژارە چەوساوەکان جێبەجێدەکەن.

بە مردنی (مام هۆمەر) و (خەجە) کێشەکان هەرگیز تـەواو نـابن، چـونکە چارەنووسـی هەردوو منداڵەکە بەنادیاری بۆ خوێنەر بەجێ هێڵراوە. چارەنووسی ئەو تاوانکارەش کە (مـام هۆمەر)ی لە تاریکی شەودا کوشت و بووە هۆی دڵوەسـتانی (خەجـە)ش لـە خەفـەتان هـەر بەنادیاری هێڵراوەتەوە. ئەمەش وردی و کارامەیی (محەڕەم محەمـەد ئـەمین)ی چـیرۆکنووس پیشاندەدات. چیرۆکنووس بەمەبەستەوە ئەمەی کردووە، چونکە ئەو سەرنجی خوێنـەران بـەم شێوەیە بۆ ئەوە رادەکێشێت کە چینی پارەدار و دەوڵەمەند هەموو جـۆرە تاوانێـك بـەنهێنی ئەنجام دەدات و بەجۆرێکی واش پەردەپۆشی دەکات کە تووشی لێپرسـراوێتی یاسایی نەبێت.

لە دوا بڕگەی چیرۆکەکەدا، ئەگەر بەشـێوەیەکی ناڕاستەوخۆش بێـت، چـیرۆکنووس دەیەوێت ئەوە بە خوێنەران رابگەیەنێت کە هـەرگیز کێـشەی چـینایەتی بـە مـردن و نەمانی نەوەیەکی هەژاران بەکۆتا نایەت، چونکە چەوسـێنەران بەردەوام هەژارانی تر لە کۆمەڵگە بەرهەم دەهێننەوە:

کەس نازانێت هەردوو منداڵەکە چیان بەسەر هات. رەنگە ئێستا ئـەوانیش لـەناو تاریکایی قەبردا بن..رەنگە ئێستا لەناو ئەو جەڵەبـە منداڵانـەدا بـن کـە بـەزۆر لـە کۆڵانەکانا دەست لەبەر خەڵکی پان ئەکەنەوە، شەویش لانەیان توونەکەیە... (محەڕەم محەمەد ئەمین، هەمان سەرچاوە، لاپەڕە : ٤٤).

ئەگەر (مام هۆمەر) و (خەجە)ش لە ژێر چڕنووکی بێبەزەیی چەوسێنەران ئازاریان چەشـت و لە کۆتاییشدا بەشێوەیەکی کارەساتاوی مردن، دوو نەوەی دژمیەکی تر کە خۆیان لە منداڵە

هەژار و بێکەسەکانی هەژاران و کوڕە دەوڵەمەندە بەدمەستە تاوانکارەکانی دەوڵەمەندان بەرجەستە کردووە دەمێننەوە. نەوەیەك دێت و نەوەیەك دەڕوات، بەڵام ئەو جیاوازی چینایەتییە گۆڕانکارییەکی وای بەسەردا نەهاتووە و نزیکەی هەروەکو خۆی ماوەتەوە.

دوای تێپەڕبوونی پتر لە پەنجا ساڵ تا ئێستاش منداڵە هەژارە هەناسەساردە دواڕۆژ نادیارەکان ، لەبەر نەبوونی و هەژاری شەقام و کۆڵانەکانی شارەکانیان داگیرکردووە. جا ئەوان، یان سواڵکەرن، یان کلینیکس و بنێشت فرۆش. کەواتە تا کۆمەڵگە یاسا و ڕێسایەکی پڕ لە دادوەری و مرۆڤانە بۆ دابەشکردنی کار و بەرهەم و دەسەڵات دادەنێت ئەو کێشەیە هەر بەزیندوویتی دەمێنێتەوە.

### شەشەم: ئەنجامی لێکۆڵینەوەکە

نووسەری ڕۆشنبیری خاوەن دیدی مرۆڤپەروەرانە هەمیشە بەزیندوویی دەمینێتەوە: نەخۆی دەمرێت و نەبەرهەمەکەیشی. جا چونکە (محەرەم محەمەد ئەمین) نووسەرێکی ڕاستگۆ و مرۆڤپەروەر و ویژدان زیندوو بوو، بیرو باوەڕ و ڕوانینە تیژ و قووڵەکانیشی هەڵقوڵاوی ناوجەرگەی کێشە و ئاریشە ڕاستەقینەکانی کۆمەڵگەی سەردەمی خۆی بوو. دوای تێپەڕینی زیاتر لە نیو سەدە هەردەڵێی ئەم چیرۆکنووسە پێشبینیکەرەمان باسی کێشەی هەژارانی ئەم سەردەمەمان دەکات. هەژاران نائومێد و گوێپێنەدراو و لە کونجێکی کەس پێنەزان فڕێدراو و دەوڵەمەندانیش کەڕ و نابینا و ویژدان مردوو و کەمتەرخەم لە ئاست پێداویستیەکانی ئەوان ژیان دەگوزەرێنن. ڕووخسارەکان دەگۆڕێن، بەڵام جەوهەری کێشەکان هەر هەمان شتن و گۆڕانکاریان بەسەردا نایەت. کێشەکانیش بەردەوام بەهەمان جۆر، یان بە کەمێك جیاوازییەوە خۆیان دووبارە دەکەنەوە. نەوەیەکی چەوسێنەر نەوەیەکی تری چەوساوە بەرهەم دەهێنێتەوە. هەر ئەمەشە کێشەکە و چیرۆکەکە بەزیندوویی دەهێڵێتەوە تا ئەوساتەی گۆڕانکاری ڕیشەیی لە یاسا و ڕێساکاندا دەکرێن.

هەولێر: ٢٠١٠/١١/١٥

**سەرچاوەکان:**

١) محەرەم محەمەد ئەمین ، کۆبەرهەمە ئەدەبی و سیاسی و فەلسەفییەکان ، (سلێمانی : چاپخانەی دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم ، ٢٠٠٨) ، لاپەرە : ٢٣- ٤٤.

٢) جورج پولیتزر و جی بیس و و موریس کاڤین، أصول الفلسفه الماركسيه، (صيدا-بيروت: المكتبه العصريه، بلا تاريخ)

٣) ABC of Dialectical and Historical Materialism, (trans. Into English: Lenina Ilitskaya) (Moscow: Progress Publishers, ١٩٧٦).

٤) Marx، Engels, and Lenin, The Essential Left: Four Classic Texts on the Principles of Socialism, (London:Unwin Books, ١٩٦٠)

==================================================

* ئەم بابەتە لە گۆڤاری (ئایندە) ژمارە (٩٤)ی ساڵی ٢٠١١ بڵاوکراوەتەوە.

# کێشەی بێ وڵاتی لە چیرۆکی (شای قەرەجان) ی محەرەم محەمەد ئەمین دا

د. ئازاد حەمە شەریف

مرۆڤ هەر بە وارِسك (غریزە) بوونـەوەرێكی كۆمەڵایەتییـە و حـەز لـەوە دەكـات لەگەڵ خەڵكانی تر بژیت و لـە شـوێنێك بگیرسـێتەوە. بـەڵام قـەرەج وەكـو كۆمەڵـە خەڵكێكی بەدەر لەم یاسایە هـەرگیز حـەز ناكـەن لـە شـوێنێك بگیرسـێنەوە و هـیچ پارچەیەكی ئەو زەوی یە بە وڵات و نیشتیمانی خۆیان نازانن چونكە ئەوان پێیان وایـە ئەم دونیایە موڵكی تایبەتی كەس نییە بەڵكو مـوڵكی گـشتی هەموومانـە و نابێـت كەس بەتەنیا خۆی بە خاوەنی بزانێت . بۆیەش قەرەج هـەر كوێیـەك بیانـەوێت بـۆی دەچن و رێگای ئەوێ دەگرنەبەر. هەر ئەمەشـە وای لێكـردوون ئەمـسەر و ئەوسـەری دونیا تەی بكەن و شوێنێك نادۆزنەوە هەتایە هەتایە تیایدا بسرەون و بحەوێنەوە.

هەڵبەتە ئەم گەڕان و سووڕانەی قەرەجەكان بە گەلێك شێوە لێك دراونەتەوە و راڤەی جۆراوجۆری لەلایەن قەرەجناسـانی دنیا بۆ كـراوە. هەنـدێك وای بـۆ دەچـن لەبەرئـەوەی قەرەج (ئازادی) خۆیان پێ لە هەموو شتێك گرنگتر و پیرۆزترە ، ئەوان نایانـەوێت بـچنە ژێرباری هیچ سیـستەم و دەسـەڵاتێك و ناشیانەوێت هیچ پلـە و پایەیـەكی حكـومی یـان كارگێڕی بەدەست بهێنن و ئـەوان حـەز لـە دوو وشـە ناكـەن كـە بـریتین لـە (ئـەرك و موڵكداریێتی) چونكە ئەوان لەو بڕوایەدان كە ئەرك و موڵكداریێتی مرۆڤ پەلبەست دەكەن و وای لێدەكەن خۆپەرست و بێ ئازادی بێت. جا لەجیاتی ئەوە ئەوان تـا رادەی پەرسـتن دوو وشەی تریان لا پیرۆزە كە ئەوانیش (خۆشـەویـستی و ئازادی)ن.

هەندێك قەرەجناسانی تر وای بۆ دەچن کە لەبەرئەوەی قەرەج تێکەڵەی چەندین هۆز و تیرەی نەتەوەی جیاجیان هیچ ناسنامەیەکی نەتەوەییان نی یە و هەربۆیەش هیچ وڵات و جێگایەك بە هی خۆیان نازانن و هەتا هەتایە بەبێ نیشتیمانی دەمێننەوە. خەڵکانی تر و هەندێك قەرەج خۆشیان بانگەشەی ئەوە دەکەن کە چونکە باپیرە گەورەی ئەوان دوای بوون بەمەسیحی بابان داوەتەوە سەر بتپەرستی نەفرەتی خوداییان بەسەردا باریوە و دەبێت هەتا لە ژیاندا مابن هەر وێڵ و سەرگەردان بن.

بەڵام چیرۆکنووسی بلیمەتی کورد (محەرەم محەمەد ئەمین) لە چیرۆکی (شای قەرەجان) دا لە کورتترین و پوختترین شێوەدا چۆتە ناو ناخی کەسایەتی قەرەجان و کێشەی بێ ناسنامەیی و خەمی بێ وڵاتی قەرەجانی لە (٣) لاپەرە و نیودا کورت کردۆتەوە و توانیویەتی بەتەواوی ناخی قەرەجان بۆ خوێنەر ئاشکرا بکات و وێنەیەکی جیاواز لەو هەموو وێنانەی خەڵکانی دی بەرامبەر بە قەرەجان هەیانە پێشکێش بکات. قەرەج لە زەمینەی مێشکی زۆربەی زۆری خەڵکیدا وێنەیەکی نێگەتیڤی دژبەکۆمەڵی هەیە و ئەوان وەکو کەسانێکی دز و قۆڵبڕ و فێڵباز و تێکدەر و لە رەوشت لادەر ئاماژەیان بۆ کراوە.

کەچی ئەوەی (محەرەم محەمەد ئەمین) لە کەسایەتی (حەسۆ ئاغا) ی شاکەسی چیرۆکەکەیدا بەرجەستەی کردووە ، کەسایەتیەکی کۆمەڵایەتی زۆر جیاوازە لەو وێنەیەی پێشتر خزێنراوەتە مێشکی خەڵکی. (حەسۆ ئاغا) کەسایەتیەکی تەواو مرۆڤانەیە و هەستناسکی و دڵکراوەیی و خاوەن بیروباوەڕی ئەو وا لە خوێنەر دەکات هەڵوەستەیەك بکات و بەزۆربەی رایە پێشینەکانی خۆیدا بچێتەوە. ئەو مرۆڤە ئەگەرچی گەورە و شای قەرەجانە ، بەڵام ئامادەیە شایەتی و گەورایەتی خۆی بگۆڕێتەوە و ببێتە نۆکەر بە مەرجێك خاوەن وڵات و ناسنامەیەك بێت.

هەڵبەتە لەسەرەتادا (حەسۆ ئاغا) بە هیچ شێوەیەك هەستی بە ناتەواوی و گرێی خۆبەکەمزانین ناکات تا ئەو کاتەی لەپەنایەکەوە گوێی لە گفتوگۆی کۆمەڵێك رۆشنبیر بووە کە باسیان لە خزمەتکردنی وڵات و خۆشەویستی خاك و نیشتیمان کردووە. دوای تێپەڕبوونی ماوەیەك ئەو (حەسۆ ئاغا) دەم بەخەندە و دڵخۆشە هەست بەپەستی و نازاری

دەروون دەكات و هەست بەوە دەكات كە ئەو وەكو مرۆڤ بەگشتی ناتەواویەكی دەروونـی و كەلتووری هەیە . ئەو هەستـەش پالّ بە (حەسۆ ئاغا)وە دەنێت بەدوای ناو و ناسنامەیەك بۆ خۆی و هۆزەكەی بگەڕێت تاكو ئەو ناتەواویەی خۆی پێ پڕ بكاتەوە.

هەر ئەمەشە وای لێدەكات كە هەست بـەنامۆیی خـۆی بكـات لـە باوەشـی هـۆز و خێڵەكەیدا و پەنا بۆ كەسـێكی دەرەوەی هۆزەكەی خۆی ببات بـۆ چارەسـەری ئـەو كێـشە دەروونییەی. بە ڕای پیاوێكی تەمەن چل سالّی دنیادیتەی وەكو (حەسـۆ ئاغـا) تـەنها و تەنها كەسێكی ڕۆشنبیر و خوێنـدەوار دەتوانێـت لـە دەردی ئـەو بگـات و هـەر ئـەویش دەتوانێت چارەسەری ئەو كێشەیەی بۆ بكات. هەر ئەم هەستەشـە وای لێـدەكات كـە لـە نیوەشەودا نوێنی خۆی بەجێ بهێلێت و بەدەم ئەم كێشانەوە بتلێتـەوە و پـەنا بباتـە بـەر كەسێكی تر كە نە لە هۆزەكەی ئەوە و نە هیچ جـۆرە پەیوەندیـەكی خزمایـەتی بەویـەوە دەبەستێتەوە . ئەو كەســەش گێـڕەرەوەی چـیرۆكەكە- واتـە چیرۆكنووسـەكەیە. ئـازاری (حەسۆ ئاغا) هێندە خەستە كە لەم چەند دێرەدا وەكو زووخاو لە برینەكانیەوە دەتكێت:

- تو خوا تۆ بلێی دەرمانێـك هـەبێ چـارەی ئـەو دەردە بەناسـۆرەی مـن بكـا، لەبەرچی خوا ئێمەی قەرەجی لە سروشتی مرۆڤایەتی بێبەری كردووە .. نەنیشتیمانمان هەیە و نەنەتەوە .. من مرۆڤایەتییەكەی خۆمم لێ ون بووە .. پەنام هێناوەتە بەر تۆ بۆم بدۆزیتەوە ..ئەگینا یا شێت ئـەبم یـا خـۆم ئـەكوژم. (محـەرەم محەمـەد ئـەمین ، کۆبەرهەمە ئەدەبی و سیاسی و فەلسەفییەکان ، (سلێمانی : چاپخانەی دەزگای چـاپ و پەخشی سەردەم ، ٢٠٠٨ ، لاپەڕە : ٩٢) .

بەلاّم چیرۆكنووسـیش كـە كەسـایەتی دووەمـی ئـەو چـیرۆكەیە هـیچ چارەسـەریەكی مەعقولانە و دەرمانێكی ئازارلابەرانەی بۆ دەردی بێ دەرمانی كێشەی بێ ناسـنامەیی و بێ وڵاتی بۆ (حەسۆ ئاغا) پێ نییە جگە لە چارەسەریەكی رووكەشانە. ئەویش ئەوەیە كـە داوا لە (حەسۆ ئاغا) دەكات كە ئەو شوێنانەی هەواری تیا هەلّدەدەن بە خاك و نیشتیمانی خۆیان بزانن! هەلّبەتە ئەمە چارەسەریەكی ساتەوەختی رووكەشانەیە بـۆ كەسـێكی وەكـو (حەسۆ ئاغا) كە ئازارچەشتووی دەردی غەریبی و بێ ناسـنامەیی و بێ وڵاتییە.

ئاخۆ (حەسۆ ئاغا) دڵی بەو قسە رووکەش و دڵنەوایيکەرەوانەی چیرۆکنووس ئاو دەخواتەوە؟ ئایا دوای پەیداکردنی هۆشیاری نەتەوەیی لەلایەن کەسێکی بێ خاك و بێ نیشتیمان، ئاخۆ ئەو دەتوانێت ولآت و نیشتیمانی خەڵکانی تر بکاتە هی خۆی و دڵی خۆی بە شوێنێك خۆش بکات کە نەشوێنی ئەوە و نەتیایدا هەست بە هیچ پەیوەندیەکی رۆحی دەکات؟ ئاخۆ (حەسۆ ئاغا)ی دنیادیتە و چاوکراوە هەروا بەئاسانی رازی دەبێت؟ یان ئامادەیە تا کۆتایی بەدوای ئەو کێشەیە بکەوێت و چارەنووس چی بۆ دەستنیشان بکات ئەو هەڵبژێرێت و بە دوو قسەی بێمانای دڵداردکەرەوە دڵی دانەکەوێت و هەر بەدوای وەڵامی ئەو پرسیارەوە وێڵ بێت : بۆچی قەرەج نیشتیمانێکی تایبەت بەخۆی نی یە؟

لە وەڵامی ئەو چارەسەرییە رووکەشانەیەی کە چیرۆك گێرەرەوە بۆ (حەسۆ ئاغا)ی دیار کردبوو ، ئەو دڵ و دەروونی لە کەفوکوڵ ناکەوێت و بە دڵشکاوی و نائومێدیەکی گەورەوە دەگەڕێتەوە باوەشی ئەو هۆزەی کە وەکو ئەو بێ خاك و بێ نیشتیمان و بێ ناسنامەیە. بێ گومان سەرەنجامی کەسێکی وەکو (حەسۆ ئاغا) کە گەیشتۆتە رادەی نائومێدیەکی تەواو هەرگیز باش نابێت. هەر بۆیەش خوێنەران چاوەروانی شتێکی یەگجار خراپ لە کەسانی وەکو ئەو دەکەن . ئەمەش سەرەنجام پاڵ بەم مرۆڤە نائومێدە ورە ڕووخاوەوە دەنێت کە هەست بەکەمی و پووچایەتی خۆی بکات و بگاتە ئەو هۆشیاریەی کە ئەو شایەکی بۆشە لەناو جێگایەکی بۆش دا دەژیت و سەرۆکایەتی هۆزێکی هەستمردووی مێشك بۆش دەکات. ئەم هەستکردنە بە بۆشایی خۆی و خەڵکەکە و شوێنەکە بۆشایی ناو دەروونی (حەسۆ ئاغا) هێندەی تر فراوان دەکات کە وای لێدەکات بێ سێ و دوو بە ئاراستە و رێگایەکدا بڕوات کە گەڕانەوەی بۆ نییە و بوون و نەبوونی خۆی لەلا وەکو یەك بێت .

لەکۆتاییدا (حەسۆ ئاغا)ی بێ ولآت و بێ ناسنامە و بێ بەها خۆی لەچاو هەموو خەڵکانی دنیا بەکەم دەبینێت و بڕیاری یەگجارەکی خۆی دەدات کە لەناوبردنی

جەستەیی خۆیەتی و بەمەش کۆتایی بە هەموو کێشەکانی خۆی وەکو قەرەجێك دەهێنێت . ئەگەرچی ئەو وەکو قەرەج کەسێکی بێ وڵات و بێ ناسنامە بوو ، بەڵام وەکو هەر کەسێکی مردوو پارچە زەویەك دەبێت کە دوای مردنی ببێتە نیشتیمانی ئێسك و پرووسکەکانی و هەتا هەتایە لەو پارچە زەویەدا بمێنێتەوە.

ئەوەی راستی بێت ، ئەم چیرۆکەی (محەرەم محەمەد ئەمین) دەکرێت لەسەر پتر لە ناستێك لێك بدرێتەوە و هەر ئاستە و بەجیا مانا و واتای خۆی بەدەستەوە دەدات. لەسەر ئاستی هێمایدا ، قەرەج هێمای هەموو مرۆڤ و نەتەوەیەکی بێ خاك و بێ ناسنامەی ئەم سەر زەمینەن و لە سەرانسەری جیهاندا و بەدرێژایی مێژوو هەر چەوسێنراونەتەوە و هەر راوەدوونراون. جا بە حوکمی ئەوەی کە ئەو قەرەجە لە کوردستاندایە و بە کوردی قسە دەکات و ناوێکی کوردی هەیە ، دەکرێت ئەو قەرەجە بە هێمای هەموو میللەتی کورد بزانین کە هەمان کێشە و دەردی بێ ناسنامەیی و بێ وڵاتی و چەوساندنەوەی هەیە . ئەوەی پتریش ئەو رایەمان دەسەلمێنێت ئەوەیە کە تا رۆژی ئەمرۆش کورد میللەتێکی بێ دەوڵەت و بێ ناسنامە و بێ مافە!

خۆکوشتنی شای قەرەجان لە کۆتایی چیرۆکەکەدا هێز و گوڕێکی تر دەبەخشێتە چیرۆکەکە و دەکرێت ئەویش لەسەر ئاستی هێمایدا لێك بدرێتەوە. ئەم خۆکوشتنە دەکرێت پەیامێکی زۆر توند بێت بۆ خوێنەر کە میللەت و خەڵکانی بێ وڵات و بێ ناسنامە بوون و نەبوونیان وەکو یەکە و رەنگە بە هەڵبژاردنی رێگای مەرگ و قوربانیدان بە پیرۆزترین شتی خۆیان کە ژیانیانە ئەوان بتوانن نیشتیمانێك و ناسنامەیەك و مانایەك بۆ ژیان بەدەست بهێنن .

بەم کۆتاییە هێمایی و پڕمەبەستەی چیرۆکەکە، (محەرەم محەمەد ئەمین) هەمان دروشمی ئەوسای کورد بەشێوەیەکی شاراوە و هونەری دووبارە دەکاتەوە کە (یان کوردستان یان نەمان)ە. بەڵام ئەمەی چیرۆکنووس بە کەمێك گۆڕان و دەستکاریەوە کراوە کە ئەویش بریتی یە لە (یان نیشتیمان و ناسنامەی نەتەوەیی یان مردن و نەمان). هەڵبەتە (محەرەم محەمەد ئەمین) ئەوکاتەی کە ئەو چیرۆکەی تێدا

بلاوکردۆتەوە سالی (١٩٦١) بوو و ئەوسا بەهیچ جۆرێك نەدەكرا راست و رەوان ئەو دروشمە بەرزبکاتەوە. هۆیەکی تری وانەکردنی (محەرەم محەمەد ئەمین) لەوەدا دەبینمەوە کە ئەو وەکو چیرۆکنووسێکی بالادەست لە هونەری چیرۆکنووسیندا توانیویەتی خۆی لە راستەوخۆیی لابدات و بەمەش ئاستی هونەری چیرۆکەکەی بەرزتر کردۆتەوە.

بێ گومان ئەو چیرۆکەی (محەرەم محەمەد ئەمین) نموونەی بەرزی هەستی نیشتیمانپەروەری چیرۆکنووس دەردەخات و هێندە پڕ وردەکارانە و کورت و پوخت ئەو مەسەلە فیکریە ئالۆزەی لە چەند لاپەڕەیەکی کەمدا خستکردۆتەوە کە ئەمە مەگەر لە دەسەلاتی چیرۆکنووسە جیهانییەکانی وەکو (گۆگۆل) و (گۆرکی) و (چیخۆڤ) و چیرۆکنووسە پەیامدارە رووسیەکان بێت کە (محەرەم محەمەد ئەمین) تا رادەیەکی زۆر بە کارەکانی ئەوانەوە دلگیر بووە.

**هەولێر ٢٠٠٩/٣/١٣**

---


**سەرچاوەکان:**

١) محەرەم محەمەد ئەمین ، کۆبەرهەمە ئەدەبی و سیاسی و فەلسەفیەکان ، (سلێمانی: چاپخانەی دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم، ٢٠٠٨، لاپەڕە: ٩٠- ٩٣).

٢) جان پول کلیبر ، الغجر : دراسه تاریخیه ، اجتماعیه ، فولکلوریه ، ت: لوتفی الخوری (بغداد : دار الحریة ، ١٩٨٢).

٣) هانزیکۆن فۆیکت ، شیعری قەرەج ، و: هەوراماندن وریا قانیع (سلێمانی : چاپخانەی دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم ، ٢٠٠٤)

٤) Konrad Bercovici, The Story of the Gypsies, (London: Jonathan Cape, ١٩٣٠)


---

* ئەم بابەتە لە گۆڤاری نەوشەفەق ژمارە (٦٦) ی ئابی ٢٠٠٩ دا بلاوکراوەتەوە.

# (شای قەرەجەکان)ی محەرەم محەممەد ئەمین لە نێوان شکستی بەردەم واقیع و شکستی بەردەم هەقیقەت

**پێشڕەو عەبدوڵڵا**

**سەرەتا**

چیرۆکی (شای قەرەجەکان) یەکێکە لە چیرۆکە باش و نایابەکانی چیرۆکنووس (محەرەم محەمەد ئەمین) (١٩٢١ – ١٩٨٠). ئێمە لەم لێکۆڵینەوەیەدا هەوڵمانداوە بە تەنها لایەنی فکری ئەم چیرۆکە ڕاڤە بکەین و لا نەکەینەوە بە ڕووی لایەنی هونەری چیرۆکنووسیندا. چونکە ئەم چیرۆکە هەم بیرکردنەوەکەی قووڵ و فرەمانایە و هەم ئەو ئەنجامەی کارەکتەری سەرەکی چیرۆکەکە پێی دەگات، ئەنجامێکی بوێرانە و چاونەترسانەیە بۆ چیرۆکنووس. ئەوەی ئێمە لێرەدا ڕاڤەمان کردووە جیاوازیە لە نێوان دوو میتۆدی جیاواز لە ڕەخنەی ئەدەبیدا ئەوانیش ڕەخنەی (دەروونی) و ڕەخنەی (هێرمنیوتیکی)ە. ئەوە ساغ دەکەینەوە کە کارەکتەری ئەم چیرۆکە کارەکتەرێکی دەروونیە، یان بوونگەراییە. بە ئومێدی ئەوەی توانیبێتمان لەم دادوەرییەماندا ڕاستیمان پێکا بێت.

**خۆگونجاندن لە واقیعدا**

فرۆید لە باسی کەسی خۆگونجێندا دەڵێت: **"لە ڕاستیدا کەسی خۆگونجێنی باش ئەوەیە (من) ی خۆی بکاتە دادوەری کەسایەتی خۆی. هەتا ئەو دادوەر و هەڵسووڕێنەری (ئەو) و (منی باڵا) بێت و هەر ئەم (من)ە پەیوەندیەکانی بە جیهانی دەرەکییەوە ڕێك بخات"**(١)

ئەوەی لێرەدا جێگەی تێڕامانە ئەوەیە، کە (من) جڵەوی مرۆڤ بگرێتە دەست و (ئەو) و (منی باڵا)ش لە ژێر دەسەڵاتی (من)دا کاروباری خۆیان ڕێك بخەن. گەڕانەوەی

سەرداری بۆ (من) لای فرۆید، ترسانە لە واقیع و لەو سزا سەختانەی واقیع هەیەتی بەرامبەر بە کەسانی یاخی و تووڕە لە واقیع. چونکە (من) لە مرۆڤدا، ئەوەندەی خەمی پاراستنی ڕۆحی واقیعە، (کۆمەڵگا) ئەوەندە خەمی پاراستنی مرۆڤی نییە.

(من) لەناو مرۆڤدا ئەو هێزە سەیرەیە کە توانای خۆگونجاندن لە واقیعدا لە مرۆڤدا رادەگرێت. شارەزای دەکات بە هەموو هەڵسوکەوتە خوازراو و نەخوازراوەکانی ناو کۆمەڵگا وەك رادارێك مرۆڤ ئاگادار دەکاتەوە کە ئەم رەفتارانە مایەی بەدەست هێنانی دڵی کۆمەڵگان و ئەم رەفتارانەش مایەی ڕەنجان و تووڕەبوونی کۆمەڵگایە. کێشەکە تا ئێرە ئاساییە و ئەم کارەی (من) دەیکات لە مرۆڤدا تا ئێرە باشە، بەڵام کاری ترسناك ئەوەیە بەردەوام (من) مرۆڤ ناچار دەکات ئەوە ئەنجام بدات کە مایەی ڕازیبوونی کۆمەڵگایە. ئەمەش هەموو لە پێناوی پاراستنی کەسەکانە هەتا تووشی دەرکردن وماڵوێرانی نەبن و نەکەونە بەر ڕقی عەقڵی کۆمەڵگا. "من بەڕێوەبەرێکی زیرەکە بەردەوام هەوڵی مانەوەی تاك دەدات، مانەوەیەکی تەواو لە واقیعدا" (٢)

بەمانایەکی دیکە، (من) بەردەوام لە حاڵەتی بارگۆڕینداییە و بە پێی داخوازییەکانی واقیع خۆی دەگۆڕێت. ئیتر کاتێك مرۆڤ هەموو بوونی خۆی دایە دەست (من)ی خۆی، بە مانا فرۆیدییەکەی ئەوا هەموو بوونی خۆی داوەتە دەست (ئەویتر) و ئیتر دەبێت بەردەوام ئەوە بکات کە واقیعەکە دەیەوێت ئەمە لە زانستی دەروونناسیدا بەو کەسانە دەوترێت، کە تاکی عاقڵ و هۆشمەندن، چونکە (من)یان کردۆتە دادوەر و باڵادەست بەسەر بوونی خۆیاندا.

"(من) Ego لەسەر بنەمای حەقیقەت و لۆژیك و عەقڵانیەت ڕێدەکات " (٣)

ئەم حەقیقەت و لۆژیکە، حەقیقەت و لۆژیکێکە تەبایە بە داواکارییەکانی واقیع و هاوئاهەنگە بەو هێزە کۆمەڵایەتییەی لەناو کۆمەڵگا جیاوازەکاندا هەیە. کەسە خۆگونجێنەکان ئەوانەن (من)یان بەهێزە و توانای شاردنەوەی ڕازی دڵی خۆیان هەیە.

ئەوانەن بەردەوام زیرەکن لە خوێندنەوەی واقیعە جیاجیاکاندا و زیرەکن بەخۆ یەکسانکردن بە داواکارییەکانی ئەو واقیعە. چونکە (من) زۆر شارەزایە لە

"ڕاگرتنی هاوسەنگی لە نێوان (ئەو Id) و (منی باڵا super ego) و پەیوەندیکردن بە جیهانی دەرەکییەوە"(٤)

ئەم جۆرە کەسانە هیچ کێشەیان نییە لەگەڵ ئەوەی تا چەند ئەو واقیعە یەکدێتەوە لەگەڵ ڕاز و خەونی خۆیاندا، چونکە ئەمانە هەر لەسەرەتاوە ڕازی دڵی خۆیان کوشتووە و هەموو هەوڵێکیان ئەوەیە بمێننەوە، جا بەهەر نرخێك بێت گرنگ نییە.

ئەگەر بەم تیۆرەی لە سەرەتاوە باسمانکرد سەیری پاڵەوانی چیرۆکی (شای قەرەجەکان) بکەین، دەبینین (حەسۆ ئاغا) پاڵەوانێکە (من)ی زۆر لاوازە چونکە قەرەجە. دیارە (قەرەج) بەوەی تەسلیمی هیچ واقیعێك نابێت و ناچێتە خانەی هیچ شار و مەملەکەتێکەوە، ئەوەیە (من) یان ئەوەندە لاوازە و نایانەوێت دەستبەرداری ئەو ژیانە کۆچەرییە بن کە خۆیان هەڵیانبژاردووە، چونکە ئەوە ڕوونە بیانەوێت لەگەڵ هەر کۆمەڵێکی تردا ژیان بکەن، دەبێت واز لە ڕازی دڵی خۆیان بهێنن و خۆیان بگونجێنن لەگەڵ ئەو واقیعەدا. خۆ ئەگەر هاتوو ئەم کارەشیان ئەنجام دا، ئەوا ناسنامەی خۆیان دەدۆڕێن و لە قەرەجایەتی دەچنە دەرەوە، بەمەش دەبنە خەڵکی تر و لەناو داب و نەریت و چییەتی خەڵکی تردا دەتوێنەوە.

واتە چییەتی (قەرەج) لەو ژیانە کۆچەرییەی خۆیاندایە و بەو جۆرە ژیانە دەتوانن هەڵگری ڕازی دڵی خۆیان بن، چونکە ئەگەر بێت و ڕازیبن بە ژیانی خەڵکی دیکە ئەوا بوونی خۆیان دەسڕنەوەو بەرەو نەمان دەڕۆن. هەر وەك لە چیرۆکەکەدا گێڕەردوە باسی دەکات و دەڵێت:

"قسەکانی زۆر جار بە تام و خۆش بوو، باسی ڕەوشت و ژیانی قەرەجی بۆ ئەکردم، ئینجا ئەهاتە سەر باسی ئەو شار و وڵاتانەی دیبوونی." (٥)

کێشەی پاڵەوانی ئەم چیرۆکە ئەوەیە ناتوانێت خۆی بگونجێنێت لەگەڵ واقعێکدا و لەو خەمە ڕزگاری بێت کە گیرۆدەی بووە، بەڵام نازانێت بوون و ناسنامەی ئەو بەوەوەیە کە هەر قەرەج بێت و کەسی تر نەبێت. ئەمەش مایەی بەهێزی و پاراستنی بوونی خۆیەتی، نەك ئەوەی زانستی دەروونناسی ناوینا‌وە لاوازی و نالۆژێکی. بەمانایەکی تر کاتێك گەلێك، یان کۆمەڵێك بۆ نموونە (کورد) کاتێك نەبۆتە عەرەب و

فارس و تورك هەتا خۆش بژیت و رزگار بێت لـەو هـەموو کێـشەیە. ئەمەیـە مانـای نـالۆژیکی و بـێ عـەقڵی نییـە، بـەڵکو ئـەوە خـاڵی بـەهێزی کـوردە و هـەر ئـەم خۆنەگونجانەشە وایکردووە کورد وەك رازێك تا ئێستا ماوە و ئاشکرا نەبووە بۆ جیهان.

**یاخی بوون و شکست لە واقیعدا**

زۆرجار مەرج نییە مرۆڤ بگاتە پلە باڵاکانی واقیع با (من)ێکـی زۆر بەهێزیـشی هەبێت، چونکە زۆر واقیع هەیە مۆنۆپۆلکراوە و بوار ناداتە دەنـگ و رەنگـی تـر بـۆ ئەوەی بێتە ناویەوە.

**"کۆمەڵێك بەربەستی جیاجیا هەیە کـە تاکـە کـەس پـەك دەخـات بـۆ ئـەوەی پێداویستیەکانی خۆی دەستەبەر بکات، لەوانەش بەربەستی جەستەیی وەك نەخۆشـی درێژخایەن، یان بەربەستی ماددی وەك هەژاری یان کۆمەڵایەتی وەك بوونی یاسایەکی کۆمەڵایەتی توند کە هەڵسوکەوتی تاکە کەس سنووردار بکات."(٦)**

بەمانایەکی تر هەموو هەوڵێکی مرۆڤ بۆ بەدەست هێنانی سـەرمایەی مـاددی و رەمزی گرەنتی سەرکەوتنی نییە و زۆر جـار مرۆڤـ شکـست دەهێنێـت لـە بەدەسـت هێنانی ماڵ و پارە و دەسەڵات و...تاد.

ئەم شکـستە مرۆڤ تووشی نائومێدی دەکات و یـاخی دەبێـت. بـەڵام پرسـیارەکە ئەوەیە ئایا ئەم نامۆبوون و یاخیبوونە تا چەند دروستە مرۆڤـ هـەموو بـوونی خـۆی بخاتە خزمەتییەوە؟ بەواتایەکی تر ئایا مرۆڤـ سـەر بڵندانـە دەژیـت کاتێـك هـەموو قوربانییەك بدات بۆ ئەوەی لە واقیعێکدا بمێنێتەوە؟

لە راستیدا یاخیبوون لە واقیع و شکست بەم مانایـە یـاخیبوون نییـە بـۆ ئـەوەی مرۆڤەکە واقیعێکی تر بخاتەوە، بەڵکو تووڕەبوونی ئەو بۆ ئەوەیـە واقیعەکـە قبـووڵی بکاتەوە. هەر وەك چۆن خەڵکێك هەیە ئەمڕۆ دەست دەکەن بە جنێـو و قـسە و هـەرا دەنێتەوە بۆ ئەوەی رازی بکەن.

ئەم شکـستە و ئەم یاخی بوونە یاخیبوونێکە عەیبە، چونکە مرۆڤ لەم بـارەدا بـۆ نان و بۆ دەسەڵات دەگری و قبووڵ دەکات و نا لە شتەکان دەکات. ئەم تـووڕە بوونـە بۆ ئەوەیە مرۆڤ خۆی بفرۆشێت نەك خۆی بکڕێتەوە و رازی دڵی خۆی بـدرکێنێت. بـەم

یاخیبوونە شکستەکەی خۆی هاوسەنگ دەکاتەوە و جارێکی دیکە واقیعەکە بەلای خۆیدا کەمەندکێش دەکاتەوە. واتە کاتێك واقیعەکە بەو شێوازە قبوولّی ناکات کەسەکە لە رێگەی ئەو یاخیبوونەوە وا دەکات واقیعەکە قبوولّی بکات. ئەمەش خراپترین و قێزەونترین شتێکە مرۆڤ ئەنجامی بدات. چونکە کەسەکە فێلّ دەکات، بۆ ئەوە یاخی نییە خاوەن بەرنامە و بنەمایەکی ترە بۆ ژیان بەلّکو بۆ ئەوە یاخییە دلّداری بکات لەگەلّ واقیعدا. بۆ ئەوەی واقیع قبوولّی بکات خەمی ئەم جۆرە کەسانە خەمی نان و دەسەلاّت و سەرمایەیە نەك حەقیقەت و راستی.

(کورد) یەکێکە لەو گەلانەی کە یاخیبوونی بۆ ئەوە نەبووە خۆش بژین بە مانا بایەلۆژیەکەی، یان بۆ پارە و دەسەلاّت و کورسی. نەخێر!

یاخیبوونی کورد یان شکستەکانی شکستی بەردەم حەقیقەت بوون شکستی و یاخیبوونی بەردەم خەونێکی ئەنتۆلۆژی بووە، کە ئەویش دەرکەوتنی ئەخلاقیاتێکی وا کە گوزارشت لە رۆحی کورد بکات نەك خەمی پارە و دەسەلاّت. چونکە ئەگەر وابا ئەو کات کورد بە برێك پارە، یان کورسیەك سازشی لەسەر بوونی خۆی دەکرد. یەکێك لەو ساتە جوانانەی لەم چیرۆکەدا بەرچاو دەکەوێت لەلای (حەسۆ ئاغا) وەك کارەکتەری سەرەکی ئەم چیرۆکە ئەوەیە شکست و خەمی ئەم پیاوە بۆ خانووی جوان نییە کە وەك قەرەجێك بلّێت بێزار بووم لە تاولّ و دەشتودەر، یان بۆ پارە، یان بۆ .....تاد بەلّکو خەم و شکستی ئەو بۆ حەقیقەتێکی گەورەیە ئەویش بوونی نیشتمانێکە بۆ خۆی.

هەر بۆیە ئەم کارەکتەرە هەلّگری بەها و جوانییەکە چونکە، عاشقی حەقیقەتە نەك (من)ی خۆی. هەر ئەم عەشقەشە وای لێدەکات رازی نەبێت بە شوێنەکان و خەمێکی گەورەتر هەلّگرێت کە لە روحی خۆیەوە نزیکە نەك جەستەی. "ئەیەوێ نیشتمان و نەتەوەی هەبێ وەکو هەموو خەلّکێکی تر، بەلاّم چۆن یارمەتی بدەم و لەم بێ هیواییە رزگاری بکەم."(٧)

گەورەیی مرۆڤ لەوەدا نییە خەونی پارە و سەروەت و سامان و دەسەلاّت بکاتە خەم و هەولّی خۆی، چونکە ئەوانە شتانێکن ئەگەر مرۆڤ بووە خاوەنیان و پێیان گەیشت هەر خاوەن نییە، چونکە واقیع خەسلّەتی راگوزەری هەیە و بەردەوام لەبار

گۆڕیندایە. هی ئەوە نییە مرۆڤ پاڵی پێوە بدات و بیکاتە بنەما، چونکە ئەگەری ڕووخانی لە پێشە. ئەم خەونە خەونێکی نەزۆك و مایەی عەیبەیە بۆ مرۆڤ. گەورەیی مرۆڤ لەوەدایە خەونی بەرجەستەبوونی حەقیقەتی هەبێت. حەقیقەتێکی گەورە بکاتە نامانجی خۆی، ئەگەر لەو ڕێگەیەشدا مرد، یان شکستی خوارد، ئەوا شکستێکە پڕە لە جوانی و پڕە لە فەنتازیا. شکستێك نییە مایەی عەیبە بێت بۆ مرۆڤ، بەڵکو شکستێکە مایەی سەر بڵندی و سەربەرزییە.

**خۆگونجاندن لەگەڵ حەقیقەتدا**

باسکردنی حەقیقەت و لێکۆڵینەوەیی کارێکی هەروەها ئاسان نییە، بەلاّم ئێمە هەوڵدەدەین لە پێناوی بابەتەکەماندا زۆر بەکورتی باسیبکەین. مارتن هایدگەر لە باسی حەقیقەتدا دەڵێت:

**"شتەکان بەوەی کە خولقێنراون لە بوون و چییەتی خۆیاندا لەسەر هەمئاهەنگ بوونیان لەگەڵ ئەو ئایدیاڵەدا بەندن کە پێشتر لە بیری خواییدا هەبووە، سازی ئەو خولقێنراوانە لەگەڵ ئایدیاڵەکەیان مانای (حەقیقەت) دەگەیەنێ."(٨)**

ئێمە دەکەوینە بەردەم دوو عەقڵی جیاواز: یەکەمیان عەقڵی خوایی و دووەمیان عەقڵی مرۆییە. عەقڵی خوایی بەوەدا خولقێنەرە، هەموو شتە خولقاوەکان لەسەر بنەمای ئەو ئایدیاڵە دەڕۆن بەرێوە کە لە عەقڵی خواییدا بوونی هەیە. ئەمەش ڕێگە دروستەکەیە بۆ ئەو شتە کە دەبێت پێوەی پابەند بێت. واتا بوونی ئەو شتە لەسەر پابەندبوونی بەو ئایدیاڵەوە وەستاوە . ئەگەر نەیتوانی خۆی هەماهەنگ بکاتەوە لەگەڵ ئەو ئایدیاڵەدا ئەوا نەیتوانیووە ببێت. واتە ئایدیاڵی عەقڵی خوایی لەناو شتەکاندا دەبێتە بوونیان، شتەکان لە ڕێگەی وەدیهاتنی بوونیانەوە، دەیسەلمێنێت کە سازن لەگەڵ ئایدیاڵەکەیاندا کە لەناو عەقڵی خواییدا حزوریان هەیە. ئەگەر ئێمە مرۆڤ بە نموونە وەربگرین ئەوا هەر مرۆڤێك، یان هەر نەتەوەیەك بۆ خۆیان لەسەر بنەمای ئەو ئایدیاڵە خولقاون کە لە عەقڵی خواییدا بوونی هەیە.

ئەم ئایدیالە دەبێتە بوونی ئەو مرۆڤە، یان ئەو نەتەوەیە، مرۆڤــەکە بـەوە خـۆش دەژین، یان ئارام دەبێتەوە، ئەگەر توانی ئەو بوونەی خۆی هەماهەنگ بکاتەوە لەگـەڵ ئایدیالی نـاو عــەقڵی خـوایی. واتــە ئەگــەر مرۆڤــ تـوانی هــەموو هەڵــسوکەوت و رەفتارەکانی هەماهەنگ بکاتەوە بە بوونی خۆی ئەوا خۆشی هەماهەنگ کردۆتەوە بە ئەو ئایدیالەی لە عەقڵی خواییدا بوونی هەیە.

**"ئەگەر دروست بوونی شت، هەماهــەنگی بــوونی ئــەو شــتە بێــت لەگــەڵ بــیرە خواییەکەیدا ، ئەوە دروستی بوونی بیرێکی مرۆیی هەماهــەنگی بــوونی ئــەو بیرەیــە لەگەڵ ئەو شتەدا کە هەماهەنگ لەگەڵ بیرە خواییەکەدا."(٩)**

ئەگەر ئێمە بێین ئەم بیرکردنەوە زیاتر ڕوونبکەینەوە لە مرۆڤدا؛ مرۆڤــ لــە ژیــانی خۆیدا دەکەوێتە بەردەم کۆمەڵێك خەونی جیاواز، خەونی هەیە وابەستە بە واقیعــەوە. واتا واقیع ئەو خەونەی بۆ دروستکردووە هەروەك لە بەشەکانی پێشوودا باسمــان کــرد. بەڵام خەونی هەیە سەر بە (بوون)ە و خەونێك نییە لــە واقیعــەوە بــۆی گوازرابێتــەوە. بەڵکو خەون و ئاواتێکە لە ڕێگەی ئایدیالەکەوە کە لە عــەقڵی خواییــدا هەیــە، بــۆی گوازراوەتەوە. واتە ئەم خەونە لەناو بوونی خۆیایەتی. ئەم خەونە وەك دۆخێك دەبێتــە هۆی ئاراستەکردن و پاڵپێوەنانی ئەو مرۆڤە، بۆ وەدیهاتنی ئــەو خەونــە لــە واقیعــدا. مرۆڤەکەش بە پێی هۆگری و ناهۆگری خۆی بۆ ئەو خەونە زەمینــەی جیــاواز و هــەوڵی جیاواز دەخاتە گەڕ بۆ لە دایك بوونی ئــەو بــیرە. ئەگــەر مرۆڤەکــە تــوانی ئــەو بــیرە بدۆزێتەوە و لە واقیعدا بەرجەســتەیی کرد ئەوا ئەو مرۆڤە هەماهەنگــە لەگــەڵ بــوونی خۆیدا و لە ڕێگەی ئەم هەماهەنگییەوە هەماهەنگیش دەبێت لەگەڵ عەقڵی خواییــدا. بەمەش مرۆڤەکە دەگاتە ئەو شوێنەی کە خۆی دەیەوێت و خۆش دەژیت.

میللەتانی جیهان بەپێی ئەو دەرکەوتانەی هەیانە لەسەر نەخــشەی ڕووداوەکــان (دەوڵەت) یەکێکە لەو خەونە ئەنتۆلۆژییانەی کە لە بوونی خۆیانەوە هاتۆتــە دەر و واقیعیان کردۆتەوە. بەمانایەکی تر (دەوڵەت) یەکێکە لەو حەقیقەتانەی نەتــەوەکان بۆی دەژین. (کورد) یەکێکە لەو گەلانەی هەوڵی وەدیهاتنی ئەم خەونــە دەدات کــە

بەردەوام زەمینەی بۆ تاقیدەکاتەوە و خوێنی بۆ دەڕێژێت. ئەم هەوڵە هەوڵێکە هەماهەنگە بە بوونی نەتەوە و هەماهەنگیشە بەو ئایدیالەی لە عەقڵی خوایدا هەیە. بەڵام کورد هێشتا نەگەیشتۆتە ئەو ئاستەی ئەم حەقیقەتە لە خەونەوە بکاتە حەقیقەتێك لە واقیعدا بوونی هەبێت.

(شای قەرەجەکان) وەك پاڵەوانی ئەم چیرۆکە خەم و ئازار و هەوڵی ئەوەیە کە حەقیقەتێکی دۆزیوەتەوە ئەویش بوونە بە نەتەوە و دەوڵەت، واتە لەسەرەتای درککردنییەتی بەم حەقیقەتە ناوەکییە، لە هەوڵی ئەوەدایە کە خۆی وەك گەورەیەك کۆمەڵەکەی هەماهەنگ بکات لەگەڵ ئەم خەونە ئەنتۆلۆژییەدا. واتە دەیەوێت خۆی بگونجێنێت لەگەڵ ئەم بوونەدا و زەمینە و ڕێی و شوێنی بۆ فەراهەم بکات.

**"نە ئەتوانم هیچ نەتەوەێك بە نەتەوەی خۆم دابنێم و نە ئەشتوانم بەبێ نیشتمان و نەتەوە بژیم. جاران وا نەبووم، گوێم نەئەدایە ئەمە."**(١٠)

ئەوەی لەم گفتوگۆیەدا بەرچاومان دەکەوێت، حاڵەتی درککردنی کارەکتەری سەرەکی ئەم چیرۆکەیە بەو خەونە ناوەکییە و هەر ئەم خەونەشە ناهێڵێت وا بکات لەگەڵ نەتەوەیەکی تر بژیت وەك ئەوان. ئەمە لە لایەك لە لایەکی ترەوە هەر ئەم خەونەیە هیوای بۆ دروست دەکات.

ئەگەرچی ئەم چیرۆکە گێڕەرەوەکەی، لە گێڕانەوەدا لاوازە، بەڵام بیرکردنەوە قووڵەکەی وا دەکات چاو بپۆشین لە لایەنی هونەری چیرۆکەکە، یان ئەو هەڵانەی کە تێیدایە.(١١) بەڵام جوانی ئەم کارەکتەرە لەوەدایە عاشقی حەقیقەتە نەك واقیع، عاشقی بوونی خۆیەتی نەك ئەویتر، دەیەوێت وەك خۆی بژیت نەك وەك نەتەوە و گەلی تر. ئەم بیرە جوانییەکی قووڵی بەخشیووە بە (حەسۆ ئاغا) و بە وردی چیرۆکنووس لە هەڵبژاردنی بابەتی چیرۆکەکەدا.

### شکست لەبەردەم حەقیقەتدا

حەقیقەت کاتێك دەیەوێت دەرکەوێت وەك بوونێکی واقیعی، ڕووبەڕووی واقیع و زەمینە دەبێتەوە. ڕووبەڕووی ئەوە دەبێتەوە ئایا ئەم خەونە تا چەند واقیع لە ئامێزی

دەگرێت، یان تا چەند بەربەستە لە وەدیهاتنی، مەرج نییە هەموو حەقیقەتێك واقیع بیگرێتە خۆی، یان زەمینەی گونجاوی دەست بکەوێت. لەم بارەدا ئەو حەقیقەتە وەك خەونێك هەر لەناو مرۆڤدا دەمێنێتەوە و بارودۆخی کەسەکە دەشوێنێت.

ئەگەر هاتوو ئەم کەسە هەر سوور بوو لەسەر ئەم حەقیقەتە کە واقیعی بکاتەوە ئەوا واقیع سزای دەدات و لەناویدەبات، وەك سوکرات. سوکرات کوژراوی دەستی ئەو واقیعە بوو، کە دوژمنی حەقیقەت بوو. بۆیە بەو دەردەی برد. یان ئەوەتا مرۆڤەکە دەیباتەوە ناو خۆی و کۆ بەکۆ لەگەڵ خۆی دەیبات.

حاڵەتی کارەکتەری سەرەکی ئەم چیرۆکە، حاڵەتی کەسێکی سەراسیمە و سەرگەردانە. (حەسۆ ئاغا) کاتێك دەزانێت ئەو حەقیقەتە ناوەکییە، دەرەکی نابێتەوە ئیتر خۆی بەشایەنی ئەوە نازانێت بژین، بۆیە تووشی (خۆکوشتن) دەبێت. ئێمە واز لەوە دەهێنین تا چەند ئەم خۆکوشتنە ڕەوایە، یان نا، بەڵام ئەم شکستە زۆر جیاوازە لەو شکستەی مرۆڤ لە واقیعدا تووشی دەبێت. ئەم شکستە هەڵگری مانایەکە، هەڵگری ڕاز و نیازێکە جوانییەك هەیە لەناویدا مەوج دەدات. مردنی سوکرات تا کۆتایی جوانی جوانە. ئەم شکستە مایەی سەربەرزی و ئازایەتییە. کەسە شکست خواردووەکان ئەوانەی شەهیدی ئەم ڕێگەیەن، هەمیشە مایەی سەربەرزین، هەمیشە دەبنە ڕەمز و وەك موقەدەسێك دەمێننەوە. ئەو بیرەی لە وێنەی (عومەری خاوەر) دا هەیە کاتێك خۆی دەکاتە قەڵغانی پاراستنی ئەو منداڵە. ئەم مردنە مردنێکە پڕە لە ژیان، پڕە لە ئاوێزانبوون بە سەرمەدی. شکستێکە شەڵاڵە بە هەستانەوە، شەڵاڵە بە هەڵگیرساندنی شۆڕش و وشیارییەکی گەورە بەرانبەر بەو حەقیقەتە. حەقیقەتێك هەیە بەم مردن و شکستە خۆی واڵا دەکات و گشتی دەبێتەوە لەناو کۆمەڵدا. تا ئەو ساتە ئەو حەقیقەتە شاراوە و پەنهانە، بەڵام لەم شکستانەدا بوونی دەردەکەوێت.

ڕاستە ئەم کارەکتەرە خۆی دەکوژێت، بەڵام کێشەیەك ئاشکرای دەکات ئەویش گەڕانی مرۆڤە بە شوێن ماڵی خۆیدا کە مرۆڤ نەیتوانی ماڵی خۆی بدۆزێتەوە ئیتر شایەنی ئەوە نییە بژیت.

## سەرچاوە و پەراوێزەکان:

١- تا: كالفن-س. حول مبادئ علم النفس الفرويدي، ت: دحام الكيال، الطبعة الثانية، مكتبة النهضة، بغداد، سنة ١٩٧٣، ص ٢٩.

٢- تا: عبدالرحمن محمد العيسوي، سيكولوجية الشخصية، مطبعة عصام جابر، مصر، سنه ٢٠٠٢، ص ١٣٨.

٣- س. پ، ل١٣٨.

٤- س. پ، ل١٣٨.

٥- محەڕەم محەمەد ئەمین، شای قەرەجەکان، کۆ بەرهەمی ئەدەبی و سیاسی و فەلسەفییەکانی محەڕەم محەمەد ئەمین، چاپخانەی دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم، سلێمانی، ساڵی ٢٠٠٨، ل ٩٠.

٦- د. هاشم جاسم السامرائي، المدخل في علم النفس، الطبعة الثانية، بغداد، سنه ١٩٨٩، ص١٣٠.

٧- محەڕەم محەمەد ئەمین، شای قەرەجەکان، ل ٩٢.

٨- مارتن هايدجر، كتابات اساسيه، الجزء الأول، ت: أسماعيل محسن، المجلس الأعلى للثقافة، القاهره، ٢٠٠٣، ص٦٠.

٩- د. عرفان مستەفا، بوونی مرۆڤ و دەرکەوتەکانی، چاپی یەکەم، چاپخانەی منارە، هەولێر، ساڵی ٢٠١٠، ل ٩٣.

١٠- محەڕەم محەمەد ئەمین، شای قەرەجەکان، ل ٩٣.

١١- لەبەشێکی چیرۆکەکەدا (حەسۆ ئاغا) شای قەرەجەکان دەڵێت:

"وا خەریکە شێت ئەبم و ئەددەمە کێو" ئەم ڕستەیە بۆ پیاوێکی قەرەج ناشێت چونکە ئەو هەموو ژیانی لە سەفەر و ئاوارەییدایە بۆیە ئەو ناڵێت وا (ئەددەمە کێو) ئەم ڕستەیە بۆ شارنشین دەگونجێ نەك قەرەج.

==========================================

※ ئەم بابەتە لە گۆڤاری (ئایندە) ژمارە (٩٤)ی ساڵی ٢٠١١ بڵاوکراوەتەوە.

# پێشەکی بۆ (گردی شەهیدان)

**کامەران موکری**

خوشك و برا خۆشەویستەکانم: لەو دەمەوە کە کۆمەڵ ئادەمیزاد بەگوێرەی ژیانی ئابووری ـ چینی (طبقة) تیا پەیدابووە، چەوسانەوە و لەسەر ئەرکی یەکتری ژیان هاتۆتە کایەوە، لەو دەمەوە کە ئادەمیزاد زیندانی بۆ ئادەمیزاد دانا و کۆتی بۆ دارشت، شۆڕشێکی ئاگرین بەرپابوو. دانیشتوانی هەر شوێنێك لە سەردەمێکی مێژوویيدا بە چەشنە شۆڕشێك هەستاون، قوربانیان داوە.

کۆمەڵی ئادەمیزاد لەوەتی پێی ناوەتە قۆناغی (بەندایەتیەوە) تا ئەمرۆ، هەر بەچنگی خوێناویەوە، ڕەورەوەی مێژووی پاڵ پێوە ناوە بۆ پێشەوە، هەر لاشەی شەهیدان بووە فەرشی ڕێی ئازادی..

کۆمەڵی ئادەمیزاد، نەتەوەکان، تا چەوسانەوە و زۆرداری نەنێنە چاڵەوە، تا کۆتایی دیلی نەهاڕن، زەبری کۆمەڵایەتی و بەگژیەکاچوونی (چینی زۆردار و زۆرلێکراو) کۆتایی نایەت. لەم تێکۆشانە سەختەدا، کە نەتەوەکان، (کۆمەڵی ئادەمیزاد) پێی هەستاون و پێی هەڵئەسن لە هەموو چەرخێکا قوربانیان داوە و ئەیدەن و هەمیشە و لە هەموو سەردەمێکی مێژوییدا، (شەهید و ئازادی) دوو وشە بوون پێکەوە لکاون.

نەتەوەی کوردیش، وەك نەتەوە ئازادی خوازەکانی جیهان وەك عەرەبی دۆست، زۆرجار لە پەرستگەی ئازادیا قوربانی خۆی پێشکەش کردووە.

کاتێ کە چاوێك بە مێژووی گەلی کوردا دەخشێنین. لەگەڵ هەناسە هەڵکێشانا بە سەربەرزیەوە ئەڵێین: (ئەگەر چی فرمێسك ئەرێژین بۆ ئەوانەی لەڕێی گەلا کۆچیان کرد، بەڵام شانازیە کە بەخوێنی گەشیان لاپەڕەی مێژوومانیان ڕەنگ کرد).

هاوڕێینە: بەرزترین قوربانی، پیرۆزترین خۆبەخت کردن ئەوەیە، کە لە پێناوی گەلا، (ئادەمیزاد) ئامانجی گەل و ئادەمیزادا بێت.

ئەو کەسەی کە لە پێناوی گەلا (کۆمەڵی ئادەمیزادا) ئەمرێت، ئەگەرچی بشبێت بەخۆڵ و (با) بیکا بەسەر گەلاّ و لووتکەی کەژا، تا ماوەیەکی یەکجار زۆر لە مێژوودا، تا (هەزاران ساڵ) ناوی هەر ئەمێنێ.

خوێندەوارە خۆشەویستەکانم: ئەگەرچی لە مێژوودا هەبووە (گەل) لە ئەنجامی زۆرداری و (زرووفێکی تایبەتیا) تواوەتەوە، زمان و ڕەوشتی تایبەتی و هەموو جۆرە (شێوەیەکی) ئەماوە، بەلاّم ئەمڕۆ، لەم چەرخەدا، کە چەرخی بزووتنەوەی (نەتەوایەتییە).. چەرخی (هەقی) نەتەوایەتی پاراستنە، هەموو نەتەوەیەك هەوڵ ئەدات کە بە برایەتی، لەسایەی ئاشتیا بژی، لەم نەتەوانەش نەتەوەی کورد، کە بە برایەتی (هەوڵ ئەدات) لەگەڵ گەلی عەرەب و گەلانی ئازادیخوای ڕۆژهەلاّتی ناوەندا.

ئێمە (کورد) بەسەدانمان، یان لەسەر قەنارە، یان بە گوللە لەپێناوی کورد و برایەتی (کورد و عەرەبا) گیانیان بەخشیوە. هەمووی هەردوێنێ بوو، کە (هەمزە حەسەن) لە شەوەزەنگی زۆرداریا کرا بە (قوربانی گوللە)ی دەست بە وەزنە، سەرشۆڕە چەوسێنەرەکان.. (هەمزە حەسەن)ی جوانەمەرگ شەهیدێکی ئەم نیشتیمانەیە چونکە، ئەم قوتابییە لاوە، کە تەمەنی هەر (١٨) ئەبوو، بۆ گەل و (جوتیار) کە زۆربەی گەلن تێنەکۆشا و ڕەنجی ئەدا، هەر بە دەستی دوژمنانی گەل و (جوتیار) وەك میوەیەکی تازە گەیشتوو لە درەختی ژیان کرایەوە و هاوێشترایە، ناو ناوی یاد و شانازییەوە.

هەمزە..

برا گیان، هەمزە نوێترین شەهیدمانە، بۆیە بە پێویستم زانی لەم چەند دێڕەدا ناوی پیرۆزی بەرم.

براو خوشکی خوێندەوارم: لام وایە بچووکیی ئەم چیرۆکە (خنجیلەیە) هەر ئەوەندە ڕێم ئەدا کە ئەم چەند دێڕە کەمەی لەبارەوە بنووسم، تکا ئەکەم بەوردی بیخوێنەرەوە،

بەقووڵی سەرنجی لێ بدە، چونکە چیرۆکێکە ئەژمێرێت بەنموونەیەکی نایاب لە چیرۆکی نیشتمان پەروەری، وە شایانی ئەوەیە کە وەك ئەو چیرۆکانە سەیر بکرێت کە لەناو جەرگەی (گەلەوە) هەڵقوڵاون.

چونکە ئەم چیرۆکە ئەگەرچی باسی رووداوێکی (دیاریکراو) نییە، بەڵام نموونەیەکە بۆ سەدان بەسەرهاتی وا کە لە نیشتیمانی ئێمەدا رووی داوە. زۆرجار نیشتیمانمان داگیرکراوە، دوژمن شارمانی وێران کردووە، زۆرجار رۆڵەی ئەم خاکە هەزارانیان دەربەدەر و بێ سەرو شوێن بوون، ئاوردانەوەیەك لە رابردوو، لە (دەبۆکەی) جاران لە گردی (یارە) لە (بازیان).. تاد، زۆر شوێن و کاتی تر سەدان نموونەمان ئەخەنە بەرچاو لە رووداو و چەشنە بەسەرهاتێك وەك هی ئەم چیرۆکەی کاك محەرەم.

خوێندەوارە بەرێزەکانم: لام وایە پێویست بەوە ناکا، (کاك محەرەم محەمەد ئەمین)تان پێ بناسێنم و پێشکێشتانی بکەم.. چونکە لە چیرۆکی (گۆمی شڵەقاو) و (مام هۆمەر) و نووسینە وردەکانیا و تەرجەمە بەتامەکانیا ئەیناسن.

# بیر و بۆچوونەکانی عومەر مەعرووف بەرزنجی لەمەڕ هەندێ لە چیرۆکەکانی محەرەم محەمەد ئەمین

**لە کتێبیی (لێکۆلینەوە و بیبلیۆگرافیای چیرۆکی کوردی)دا**

سالانی پێش تەمووز رۆژگارێکی تاڵ و بەیەکاچووبوو، سیستمی ولات بەسترابوو بە پاشکۆی ئیمپریالیزم و پەیمانە دەوڵەتییەکانەوە سامان و بەری رەنجی زۆربەی گەل بۆ دەستەیەکی تایبەتی بوو، جەماوەریش نەبوونی و کوێرەوەری بەبالایاندا بڕابوو، جوتیارانیش لە زەوی خۆیان بێبەشکرابوون و هەر رۆژەی لە شار و گوندێکا دەگیرسانەوە، کرێکاران لەبەر بێکاری ستەم و ئەشکەنجەیان دەنۆشی، لەم زروفە ئالۆز و تایبەتییەدا نووسەرانی ئەو سەردەمە هاوبەشییەکی نزیکیان کردووە لەگەڵیاندا و ئەو دەرد و ئازار و پەژارەیەیان لە رێگای نووسینەوە دەربڕیوە، پاڵەوانی چیرۆکەکانیش تێکڕا هەژارێکی راستەقینەن کە بەختەوەرییان لێ زەوت کراوە. لەلایەکی ترەوە نووسەرانی کورد لە ناوەڕاستی پەنجاکانەوە تەنها بە مەسەلەی جوتیار و دەرەبەگی لادێوە نەوەستاون.. بەڵکو هەنگاوی تازەیان ناوە و روویان کردووەتە چینە هەژارەکانی ناو شارەکانی کوردستان، وەك بیانەوێ ئەوە بسەلمێنن کە رژێمی نیمچە دەرەبەگایەتی تەنها دوژمنی هەژار و رووتەکانی لادێ نییە، چونکە دەسەلاتدارانی شار و لادێ بەرژەوەندییان پێکەوە گرێداوە و زۆربەی پاڵەوانی چیرۆکەکانیش دووچاری چەند داوێکی نەهامەتی بوون و رێگای ناڕەوایشیان هێنراوەتە بەردەم وەك دزی و لەش فرۆشتن و دیاردە ناشیرینەکانی هەموو کۆمەڵێکی دیل و دواکەوتوو، کە بەمەیش ئەوەندەی تر توانای کەسەکانیان کەمکردۆتەوە و زۆربەیشیان بە رووداوی کتوپڕ

کۆتاییان پێهێنراوە. لەو نووسەرانەیش کە لەپێش هەموویانەوە لە دەرگای باسی ژیانی هەژارانی ناو شارەکانی داوە و رەوشتی بازرگان و سوخۆر و دەسەڵاتدارەکانی دەرخستووە، کرۆکی نەتەوایەتیشی لەیاد نەکردووە (محەرەم محەمەد ئەمین)ە.

ئەم نووسەرە کەردستەی بابەتەکانی لەناو جەرگەی بێکارەکانی شارەوە دەرهێناوە و دەستنیشانی مرۆڤی پاکی کردووە... یەکێ لە هەوڵەکانیشی چیرۆکی (مام هۆمەر)ە کە بینای ئەدەبی خۆی لەسەر بنیاتناوە کە تارادەیەك رەنگی حەقایەتی کوردی پێوە دیارە و بە چەشنی سەرەتای کارێکی ئەدەبی هەندێ ئالۆزی و نەگونجان بەدی دەکرێ لە نێوان رووداوەکاندا. سەرتاپا بابەتەکانیش نەخشەی خێزانێکی هەژارە کە بە نەبوونی و گوزەرانێکی تاڵ رۆژگاریان بەرێکردووە. مام هۆمەر پیرەمێردێکی کۆڵهەڵگرە و لەبەر دەستکورتی ئەو رۆژەی نەیتوانیوە خۆراکی منداڵەکانی بەدەستبێنێ، دەکەوێتە سەر رێی دزیکردن لە ماڵی بایز بەگی دراوسێیان، لەم کاتەدا پێی دەزانرێ و راپێچی بەندیخانە دەکرێ و بە(٣) مانگ بەندی مەسەلەکە دەبڕێتەوە. لەم ماوەیەدا لەبەر نەبوونی دەسمایەی ژیان (خەجێ)ی ژنی دەکەوێتە بارێکی ناهەموارەوە و برسێتی توانای لێدەبڕێ، زۆریشی پێ ناچێ گەندەڵی باری کۆمەڵایەتی راپێچی دەکاتە مەیانی لەش فرۆشتنەوە، لەم رێیەوە خۆی و منداڵەکانی لە دەست برسێتی قوتار دەکات؛ بەڵام دوای (٣) مانگ کە مام هۆمەر بەندییەکەی تەواو دەبێ، لە کارەساتێکی کت و پڕ و ناخۆشدا دەمرێ و ژنەکەیشی بەدوایا، دوو منداڵ ساواکەشیان بەبێ کەس دەمێننەوە.

ئەم بابەتەی نووسەر نموونەیەکی سادەی سەدان خێزانی برسی و بێکارە بووە و کەسەکانیش لە جەرگەی واقیعی کۆمەڵەوە دەرهێنراون و مرۆڤی سینە پاکن، لە رووێیکی ترەوە درندەیەتی و نەگریسی بەگەکانی ناو شار دەردەخات.. کە بایز بەگ یەکێکە لەوان و، لەرووی چینایەتییەوە دوو رووی نالەباریان هەیە.. رووی دەرەبەگێك کە پەیوەندی بە زەوی جوتیارەوە بێ، هەروەها پەیوەندییان بە بازاری کشتوکاڵ و بازرگانی گشتی و سەلەم و سوو. نووسەریش ئەم جۆرە کەسانەی وەك مرۆڤێکی خوێنمژ و چارەڕەش هێناوەتە سەر شانۆی ژیان کە سێبەری مرۆڤایەتی بەلایاندا گوزەر

ناکات، بۆ ئەمەیش مام هۆمەر لەکاتی لێپرسینەوەدا دەڵێ: (بۆ من ئەگەر قاپێ چێشت بەرم لەو چێشتەی کە بەرەنجی رەش و رووتی گەلێ کەسانی وەکو من هاتۆتە بەرهەم، بەدز دەدرێمە قەڵەم؟ ئەی بایز بەگ بۆ بەدز نادرێتە قەڵەم کە بەری رەنجی هەزاران هەژاری بە زۆرەملێ دەخوا؟)[1].. کە ئەمەیش تروسکایی ئەو هەستی جیاوازی چینایەتییە بەشەوقتر دەکات کە لە نێوان چینەکانی گەلدایە.

لەرووی چوارچێوەی گشتی چیرۆکەکەوە نووسەر بە چەشنی بابەتەکانی ئەو سەردەمە، پاڵەوانی چیرۆکەکەی بەرەو هەوراز و هەڵدێری بەسام بەرێکردووە کە نەتوانن بیبڕن و دەستی هیوا بگرن... ئەوەتا مام هۆمەر خراوەتە زەلکاوی دزیکردنەوە و خەجێی خێزانیشی رێگایەکی دژوارتر، کە ئەمانە هێندەی تر تاڵی بەسەرهاتەکانی گرژ کردووە و نەتوانراوە کە رێگەی دروستی ژیان بدۆزنەوە، هەرچەندە مرۆڤی پاك و سادەن.

نووسەر دوای چەند ساڵێکی کەم بەسەر ئەم بەرهەمەیدا هەنگاوی خێراتری ناوە لە مەیدانی چیرۆکدا، گەر لە (مام هۆمەر)یشدا نەیتوانیبێ بنکەی چیرۆك بەباشی بچەسپێنێ و قەڵەمی خۆی لە کێشانی هێڵی درشتی رووداوەکاندا زاڵبێ، ئەوا لە هەنگاوەکانی تریدا وردتر بۆ کارەسات و مەودای هونەری چیرۆکەکانی ڕوانیوە. چیرۆکی (سەیرانێك لە ئەزمڕ) سەرکەوتنێکی ئاشکرایە لەم مەیدانەدا و کەسانی چیرۆکەکەیشی نابەستێتەوە لە جغزێکی تەسکی تایبەتیدا، بەڵکو ماوەیان دەخاتە بەردەم و وازیان لێدەهێنێ کە لە بزووتنەوەیەکی بەردەوامدابن و بتوانن رەنگی گیروگرفتەکانیان برێژن و کرۆکی ناگزۆرییەکانی ژیان بهێننە سەر دەسگای شیکردنەوە و بەرچاوخستن، بەشدارانیش تیکڕا مرۆڤی ساکاری کۆمەڵی کوردەوارین، نووسەریش بەوەستایی بەناخیانا رۆچووە و رووی کۆمەڵایەتی هەریەکەیانی خستۆتە پێش چاو، لەناو بەرگ و کاڵاێکی شڕ و پەککەوتەدا، لە دیمەنێکی شێواو و ناناسایی و قۆشمەییدا سیمای دەروونپاکی و خۆزگەی پیرۆزی دەرهێناون و چەمکێکی ژیانی چەوساوە و بێکارەکانی شاری هەڵداوەتەوە... بەتێڕوانینێکی گشتلایی و خوێندنەوەیەکی بەمەبەست دەگەینە ئەو قەناعەتەی کە چیرۆکنووس توانایەکی بەربڵاوی هەیە لە پیشاندانی سەروسیما و

هەڵس و کەوت و ڕەوشتی مرۆڤی کورددا، لەلایەکی ترەوە نووسـەر وەك لـەم چـیرۆکە و (پەتیارە)دا دەردەکەوێت، کە زۆرجار ویـستوێتی کەسانێ هەڵبژێرێ جڵـەوی ڕووداوەکـانی بدا بەدەستەوە کە سەرچاوەی گاڵتەبازی و پێکەنین بن وەك بیەوێ تـەعبیر لـە نـاڕەزایی مرۆڤی کورد بکا بەرانبەر بەو ژیانە. چیرۆکی (زیندووی مردوو)یش تابلۆیـەکی هـەوڵ و تێکۆشانە لە شێوەیەکی ڕەمزیدا بۆ هیوایەکی دیاریکراو بۆ بەگژاچوونی نوێنەرانی زوڵم و ستەم و هـانی جـەماوەر دەدات بـۆ تەقینـەوە بـەڕووی ئەوانـەی کـە زۆربـەی گـەل دەچەوسێننەوە و بەمەبەسـتی فرێـدانی کـاژی دواکـەوتن و خـەو لەخۆخـستن، چـونکە (بزووتنەوەی بێ ئامانج بەهیچ کلۆجێ مانای ژیان نابەخشێ)(٢).

محەرەم محەمەد ئەمین ** لـە چـیرۆکی (شـای قەرەجـەکان)دا دیـمەنێکی تـازەی بەدیکردووە و ڕووێکـی تـری بیرکردنـەوەی مرۆڤـی نیـشانداوە بەرامبـەر بـە ژیـان، پاڵەوانی چیرۆکەکە مرۆڤێکە دەروونپـاك و خـاوەن هەسـتێکی زینـدوو، لـە ئـەنجامی نەبوونی مەڵبەنـدێکی دیـاریکراودا جۆرەهـا کـسپەی لـە جەرگـەوە هەسـتاوە و لـە دەروونیەوە قوڵپدەدات. ئەم خۆخواردنەوەیە و گەلاڵەبوونی سۆز و هەستی بێ وڵاتی لە دەروونی کۆمەڵە قەرەجێکدا، بـووە بـەهۆی کوژاندنـەوەی چـرای ژیـانی گەورەکـەیان چونکە تروسکایی نابینێ و متمانەیان پێ ناکرێ و بەچەشنی مرۆڤی تر تێناکۆشـێت و سوود لە هەوڵیان نابینن، نووسەریش بەشێوەیەکی نزیك ڕەمزیەت گرێـی باسـەکەی کردۆتەوە و مەسـەلەیەکی گەورەتری پێ درکاندووە کە نـەبوونی بـاوەڕ بـە قـەوارەی میللەتان، قوربانیدانیشی بە یەکێك لە چارەسەرەکان داناوە لەم بوارەدا.

==========================================================

١- محەرەم محەمەد ئەمین – مام هۆمەر – هەولێر ١٩٥٤ ل ١٢

٢- محەرەم محەمەد ئەمین – گۆمی شڵەقاو – بەغداد ١٩٥٧ ل ٦٦

٣- لە کتێبی (لێکۆڵینـەوە و بیبلیۆگرافیـای چـیرۆکی کـوردی)دا – عومـەر مەعرووف بەرزنجی – بەغداد ١٩٧٨ لە لاپەڕەکانی ١٠٩ تا ١١٣ وە – وەرگیراوە.

** ئەم بڕگەیەش لە هەمان کتێبی ناوبراودا .. لە لاپەڕە ١٣١ ەوە وەرگیراوە.

# بیر و بۆچوونەکانی حوسێن عارف لەمەڕ هەندێ لە چیرۆکەکانی

## محەڕەم محەممەد ئەمین

**لە کتێبی (چیرۆکی هونەریی کوردی)دا**

(محەڕەم محەمەد ئەمین لە (مام هۆمەر ـ ١٩٥٤)دا.. باس لە دزیکردنێکی جان ڤالّ جانانەی مام هۆمەرێکی برسی و هەژاری ناو کۆمەڵگای کوردەوارییە (نەك فەرەنسای سەردەمی هۆگۆ) ـ مەبەست رۆمانی (کلۆلّان)ی ڤیکتۆر هۆگۆیە ـ .. لە زمانییەوە لەبەردەم دادگای رژێمدا دەڵێ: **(بۆ من ئەگەر قاپێك چێشت بەرم لەو چێشتەی بە رەنجی رەش و رووتی گەلێ کەسانی وەکو من هاتۆتە بەرهەم، بە دز ئەدرێمە قەڵەم.. ئەی بایز بەگ بۆ بە دز نادرێتە قەڵەم کە بەری رەنجی هەزاران هەژار بە زۆرەملێ ئەخوا؟) ل ـ ١٢.**

مام هۆمەر یەکێك بووە لەو ملیۆنەها هەژار و برسییە چەوساوانەی ویستوێتی خۆی و ماڵ و منداڵی (با بۆ تەنها ژەمێکیش بێ) لە برسێتی قوتار بکات. ئەو ئەم پێویستییە قورتمی گرتووە و ناچاری دزینی ئەو قاپە چێشتەی ماڵی بەگی کردووە. بەڵام لە نێواندا، لە نێوانی مام هۆمەر و جێبەجێکردنی خواستەکەیدا، رژێم و یاسایەکی بەرژەوەندی گشتی و ئەمن و ئاسایشی کۆمەڵ، دەبێ بەدەستێکی ئاسنین دزی تاوانکار سزا بدرێ و تەمێخواردوو بکرێ!!) *

(محەڕەم محەمەد ئەمین لە (مام هۆمەر)دا ، سەرەڕای ئەو رووە گەشەی لە مەغزای سیاسی و کۆمەڵایەتیدا هەیەتی (وەك زۆربەی بەرهەمەکانی ئەو چیرۆکنووسانەی تر)، لە هۆنینەوە و نواندنی زنجیرەی باسەکەیدا و بەتایبەتی لە تەقەلادانی بێ وچانیدا بۆ ناڵۆزاندنیان، پەی دەرپەی بەرەو هەڵدێری ساویلکەیی چیرۆکەکەی دادەخزێنێ. لە پرسیاری "بابە کەی نان ئەخۆین"ی مناڵەکەیەوە بیگرە تا دزینی قاپە چێشتەکەی لە ماڵی بایز بەگ و گرتنی و هەر بۆ رۆژی دوایی محاکەمە کردن و حوکمدانی و تا

گفتوگۆکردنە سەیرەکەی خەجەی ژنی لەگەڵ دوو لاوەکەدا و ئینجا بەربوونی لە بەندیخانە و مردنی خۆی و خەجە هەر بەو شەوە و بەو شێوە دراماتیکیە پڕ سەمەرەیە!... بە هەموو زنجیرەیەك کارەساتی بەزۆر دروستکراو و بەزۆر پێکەوەبەستراو پێك دەهێنن کە لە بنەڕەتدا جەمسەریان بریتی یە لە دزی کردنی (جان ڤاڵ جان)انەی ساکار و شێواو. بەو چەند دێڕەدا دەتوانین بە ئاسانی دەستنیشانی بکەین کە دەبێ لە چەند شوێندا سەری گومانی لێ راوەشێنین و پرسیاری بێ وەرامی دەربارە بکەین) ** 

(محەرەم محەمەد ئەمین لە (زیندووی مردوو)دا، لە بنچینەدا وەك چەندین چیرۆکی تری خۆی و چیرۆکنووسانی تر باسی هەر لە گوناهبارکردنی رژێمی گەندەڵ و هاندان بووە بۆ بەگژاچوونی و ویستویێتی بە جەماهیری چەوساوەی گەلەکەی بڵێ: (ئەگەر زیندووی - مردوو نین، بۆچی بەو وەزعە کەنەفت و ناهەموارە رازی دەبن و بۆچی سەر بۆ ئەو رژێمە شۆڕدەکەن کە دەتانچەوسێنێتەوە و بۆچی راناپەڕن بەروویدا و هەڵیناگێڕنەوە، تا لەو حاڵەتە زیندووی مردوویە رزگارتان ببێ؟!) بەڵام لێرەدا باسەکەی خستۆتە چوارچێوەی جۆرە رەمزییەتێکی شێوە فەلسەفی ئەوتۆوە کە هەم لە چێژی هونەری و هەم لە چۆنێتی بەدەستەوەدانی مەبەستدا، بەباری هەرە گونجاو و سەرکەوتوویدا نوانەدوێتی. تەنانەت هەڵبژاردنی شەخسیەتی دەروێشێك کە باسەکەی لە زمانەوە بگێڕێتەوە، کارێکی تەواو وەستایانەیە و پڕبەپڕی رەمزییەت و شێوە فەلسەفییەکەیە) ***

بەڵام مەسەلەی رێکەوت و قەزاوقەدەر (لای محەرەم محەمەد ئەمین لە (گردی شەهیدان)دا، دەبێ کوڕێکی گەنج بەپیاسە بچێ بۆ سەر گردەکە. رێکەوتی پیرێژنێك بکا کە لەسەر گۆڕێك دەلاوێنێتەوە. بکەونە گفتوگۆ. پیرژن داوا لە کوڕەکە بکا بیبات بۆ لای باوکی و لەوێ ئاشکرا ببێ کە ئەو کوڕە کوڕی پیرێژنە.) ****

---

**سەرچاوەکان**

* حسێن عارف - چیرۆکی هونەریی کوردی - بەغدا ، ١٩٧٧، ل. ١٠٠

** هـ س پ، ل. ١١٥

*** هـ س پ، ل. ١٢٤

**** هـ س پ، ل. ١٣٣ و ١٣٤.

# بیروبۆچوونەکانی سەباح غالب لەبارەی دوو چیرۆکی محەرەم محەمەدئەمین

## لەکتێبی (ئافرەت لەچیرۆکی کوردی)دا

چیرۆکی (مام هۆمەر) کە لە ساڵی (١٩٥٤)دا بڵاوکراوەتەوە، یەکەم چیرۆکی کوردییە بەشێکی گەورەی سەرەکی بۆ جینس تەرخان کردبێت و بەشێوەیەکی تاپلەیەك گونجاو لەگەڵ باری کۆمەڵایەتی و هۆشیاری سەردەمی خۆیدا پێشکێشی کردووە. چیرۆکنووس هاتووە یەکێك لە دەردەکانی کۆمەڵ بەشێوەیەکی سەرنجراکێش و کۆتاییەکی تراژیدیانەی جەرگبڕ دەنووسێ و دوولایەنی دەروونی و هەستی دوو دەستەی خەڵکی باس دەکا. یەکێکیان لە ڕێگای ئارەزوویەکی شێتانە و چێژی حەیوانانە لەسەر ئابڕوو و ژیانی ڕۆژانەی ئافرەت و سەربەرزی و پاکێتی دەمێك بۆ خۆیان رادەبوێرن، بێ ئەوەی بیر لەوە بکەنەوە کە چارەنووسی ئەو ژیانە چییان لێ بەسەردێ، یا چی ناچاریان دەکا ئەو ڕێیە بگرن. دەستەکەی دیکەش داهاتوویەکی تاڵخ و ئابڕووتکاوی چاوەڕوانیان دەکا و هەموو شتێکیان لێ حەرام دەکرێ.

مام هۆمەر و خەجەی ژنی و دوو منداڵ بە حەماڵی بەڕێوە دەچن، بەسکێ تێر و بەدوو برسی دەبن، لە ژیانێکی کولەمەرگی زۆر ئەستەم و ناخۆشدا دەژین. ڕۆژێکیان تا ئێوارە پولێکی چنگ ناکەوێ، وەك زۆربەی ماڵە هەژارەکانی ئەوکاتە، ئەوەی ڕۆژ پەیدایان نەکردایە تێوارە بێ شێو سەریان دەنایەوە. شەودادێ، دوو منداڵەکە دەکرووزێنەوە و داوای نان دەکەن، چ چارەیەك نامێنێ، لەو دیویانەوە ماڵی بایز بەگ داوەتە و... بۆن و بەرامەی برنجی سەدری گەرەکی پڕ کردبوو. مام

هۆمەر بیر لەوە دەکاتەوە بچێ قاپێ چێشت بینێ و دوو منداڵەکەی پێ ژێر بکاتەوە. پێ دەزانن، دەیگرن و دەیدەنە دەست پۆلیس. تا لەئەنجامدا بەدزێتی تاوانباری دەکەن و (٣) مانگ لە بەندیخانە توندی دەکەن.

خەجە لەوە دەفکرێ چۆن سێ مرۆڤ بژێنێ؟! چۆن نەمرن!! بۆ تێڕوانینی ئابووری وادەزانێ کە ئیشکردن و بازوو کوتان، نان پەیدا دەکا. دیارە ئەم بیرە لە شوێنێ کە مرۆڤ نرخی هەبێ جێ دەگرێ، بەڵام کە رێگرێ هەبوو، رژێمێکی نادروست لەکاردابوو، مرۆڤ داوای کاردەکا و نای دەنێ، مرۆڤ دەیەوێ ئیش بکا کەس ئاوڕی لێ ناداتەوە، لەوەوە مرۆڤ چەوساندنەوە لە رژێمی دەرەبەگی و بۆرژوازیدا دەستپێدەکا، بەوەی ئازاریان بدەن و پارەیەکی کەمیان لەبری ئیشێکی گەورە و گراندا بدەنێ.

ژنە قۆڵی لێ هەڵدەماڵێ و دەچێتە چوار ماڵ کە لەوە و پێش ئیشی بۆ کردوون، هەموویان بەو جۆرە وەڵامیان دەدایەوە (بڕۆ، بڕۆ! نەخەڵەتابی جارێکی کە بێیە بێرەیا.. تۆش وەکو مێردەکەت نیازت نییە ماڵەکەمان بپێچیتەوە؟)(١)

ئەوە بۆ ئافرەت کێشەیەکی گەورەیە کە چۆن ئیدارەی خۆی و دوو منداڵی بدا، بەتایبەتی کە کەسیان نەبێ. ناچار دەبێ بڕیاری ئەوە دەدا و منداڵێکیان بە باوەشەوە دەگرێ و منداڵێکیشیان بەدەستەوە بۆ سواڵکردن دەکەونەرێ. ئەو شەقام و چایخانە و بازاڕە دەگەرێن، تا جارێک دەچنە چایخانەیەکەوە دەبینن دوو گەنج پێکەوە دانیشتوون. ژنەش داوای یارمەتیان لێ دەکا، ئەوانیش خۆ بەخۆ پێدەکەنن و یەکێکیان دەڵێ: (ئەریمان خراپ نییە ئەڵێی چی؟)(٢)

ئەو دوو لاوە ژیانی رۆژانەیان بۆ سێکس و رابواردن و بەرەڵڵایی تەرخان کردووە، لەکەین و بەیندا کە وا حاڵی دەبن ژنە مێردەکەی بەندە، رۆستەم بە ئەریمان دەڵێ: (مێردیشی نییە بەخوا نێچیری چاکە.)(٣)

قسەیەکی زۆر لەنێوانی کوڕەکان و ژنەکەدا دەکرێن، تا رۆستەم چاوێکی لێ دادەگرێ و پێی رادەگەیەنێ ئێمە هەردووکمانین جلیشمان بۆ بشۆ و نانیشمان بۆ بکە و (وەکو ژن و مێردیش رائەبوێرین).(٤)

خەجە لەوە زۆر تێك دەچێ و ئێجگار پەرۆش و نیگەرانی ئەو دەردەسەرییە دەبێ کە بە دوو منداڵەوە تێیکەوتووە. دوای ئەوە بەدڵشکاوی زیزییەوە بۆ ماڵەوە دەگەڕێتەوە، لەوێ شتێکیان نابێ بیخۆن، منداڵەکانی زێدە پەرێشان دەبن، شەو بێ شێو ڕۆژ دەکەنەوە. بەیانی بڕیاری ئەوە دەدا بچێتەوە لای کوڕەکان و خۆی تەسلیمیان بکا. لەدڵی خۆشیدا دەیگوت (خوا ئەیزانێ لەپاش ئەوەی هەموو سەرێکم لێ هاتەوە یەك ئینجا ئەم ڕێگایەم گرتەبەر، ئەگەر هەر خۆم بوومایە قیروسیا با لەبرسا بمردبایە، بەڵام لەبەر ئەو دوو منداڵە ساوایە).(٥)

چیرۆکنووس ئەمە وەك دیاردەیەك و هەلێکی هەڵکەوتوو باسدەکا و ڕەخنەیەکی کۆمەڵایەتی دەگرێ، بێ ئەوەی بتوانێ تروسکاییەکی چارەسەر ڕەچاو بکا و لەکۆتاییدا دەبێتە نیشانەیەك بۆ بیر تەسکی و نەبوونی ئاسۆیەکی ڕووناك لای محەرەم.

لە (مام هۆمەر)دا ئەوە دیاردەکەوێ کە خلیسکانە بێ ئابڕووییەوە هەموو باری قورسایی و گرانییەکەی شانی ئافرەت یا بەگشتیتر ئەوەی ژێر دەکەوێ دەگرێتەوە. ئەوەی دی، واتا ئارەزووپەرستی سەرەوە حسابی لەگەڵدا ناکرێ. ئەو بۆچوونە و تێکڕا بیر و تێڕوانینە ئەخلاقییەکان باری فەلسەفی و مەودای تێگەیشتن و هۆشیاری کۆمەڵایەتی خەڵکەکە دیاری دەکا کە ئاشکرایە بیرکردنەوەی وا دەبێتە کۆمەڵایەتی، لەکۆتاییشدا مەترسی ئەوەی لێ دەکرێ کە سنوورێکی خاوێن لە نێوان مرۆڤ و ئاژەڵدا نەمێنێ.

چیرۆکنووس پێ خلیسکانی خەجە دەباتەوە بۆ دەردە بێ کەسی و هەژارییەکەی، وامان تێدەگەیەنێ کە ئافرەتەکە لەناخدا جگەری دەسوتێ و پێی ناخۆشە بکەوێتە لەشفرۆشتنەوە، بەڵام کاتێ خۆی بەو دوو کوڕە دەفرۆشێ!

بۆ لەو سنوورەدا نامێنێتەوە و پیاوی دیکەش بەخۆی فێردەکا و دەست تێکەڵاوییەکی فراوانی لێ دەوەشێتەوە؟! کاتێ ئەو ڕۆژەی مێردەکەی بەردەبێ..

بۆ شەویٚ یەکێك بەسەرخۆشی دەچێتە سەری و ئەویش (دەبینێ یەکێکە لەو پیاوانەی کە بەرۆژ لەگەڵیانا ڕای ئەبوارد)(٦) واتە ئافرەتەکە زیاد پێی لیٚ هەڵبڕیوە و وەکو ئەوەی ئینجا ڕابواردنی کردبێتە پیشە و هەرکەسیٚ دەستی بۆ درێژ بکا ڕەزامەندی پیشان بدا، کە دیارە بۆچوونەکەی چیرۆکنووس پێچەوانە دەبێتەوە و لەدواییدا ئافرەتەکەش ئیدانە دەکریٚ لەسەر ئەوەی کە بەتەواوی پێی هەڵبڕیوە.

محەڕەم چیرۆکەکە بەدوور لە واقیع و ئەفساناوی کۆتایی پیٚ دێنیٚ، بە بۆکسێك مام هۆمەر دەمرێنیٚ و خەجەش لەتاواندا هەر لەو کاتەدا بەلادا دەخا و بێگیانی دەکا. ئەوە قسەیەکی ڕووتە و بەو جۆرە مردن هێندە ئاسان نییە دوو قارەمان لە چیرۆکێکدا بکوژریٚ، ئەمن پێم وایە ئەوە نیشانەیەکە بۆ ئەوەی کە چیرۆکنووس دوای بەیەك گەیشتنی پیاوی سەرخۆش و خەجە و مام هۆمەر، نەیتوانیوە لە بەرامبەری ڕووداوەکاندا خۆی بگریٚ و بیرکردنەوەی هەر ئەوەندە بڕی کردووە کە چارەنووسیان بەو شێوەیە کۆتایی پیٚ بێنیٚ. ئەمەش بەڵگەیەکە بۆ بێتوانایی و بەپیرەوە نەچوونی کارەسات و ڕووداو، لەکاتێکدا کە پێویستە مرۆڤی ڕاستەقینەی وا دروست بکریٚ لەئاستی بەسەرهات و گەردشدا بێت و بتوانیٚ لەتەنگانەدا بڕیاری سەرکەوتووانە بدا.

فۆرمی چیرۆکەکە لەچاو سەردەمی نووسینییەوە چاك سەرکەوتووە، بەگشتی شێوەی گێڕانەوەیە، مەنەلۆژی تێدایە، بەڵام ڕاستەوخۆ قارەمانەکان لەخۆیاندا بیرناکەنەوە و خۆیان پێشکێش ناکەن. چیرۆکنووس کە چیرۆکخوانە دەڵیٚ کەوتە بیرکردنەوە و لەجیاتی ئەوان قسان دەکا، هەروەك بۆ تەداعییەکانیش دیسانەوە بەناڕاستەوخۆ چیرۆکنووس ڕابردووەکانیان بەئێستاوە دەبەستێتەوە، کە دەبوایە قارەمان لە ئەنجامی قسەهێنان و دیمەن و ڕووداوەکاندا شتی ڕابردووی بەبیردا بهاتایەوە، ئەوکاتە بەستنەوەی دوێنیٚ بە ئەمڕۆوە ئاسایی و گونجاوتر دەبوو.

چیرۆکی (گردی شەهیدان)یش لایەکی دیکە لە هەوڵ و تیکۆشانی ئافرەتانمان دەکاتەوە و زیاتر هاوبەشی و تێکەڵاوی ئەو نیوەی کۆمەڵ لە ژیان و بەرێوەبردن و ئازادی وەدەست هێناندا باس دەکا، بەناوی گوڵنازی شێرە ژنەوە دەنووسێ و دەڵێ (پیاوەکانمان هەموو لە کۆڕی جەنگابوون، لەشکری داگیرکەر هێرشی هێنایە ناوشار، ئێمەش کە ئافرەت و منداڵ و پیر مابووینەوە، هەر ئەوەندەمان پێ دەکرا بەکوتەك و خڕکەی بەرد و پانیبەرز هەر تەپلە بەسەرێکمان بدیایە لە ناخافڵ پیاماندا دەپلۆست و بۆی دەردەچووین.) (٧)

==================================================


## سەرچاوەکان:

١ـ محەرەم محەمەد ئەمین، مام هۆمەر، چاپخانەی کوردستان، هەولێر، ١٩٥٤، ل. ١٤.

٢ـ هەمان سەرچاوە، ل ١٧.

٣ـ هەمان سەرچاوە، ل ١٨.

٤ـ هەمان سەرچاوە، ل ١٩.

٥ـ هەمان سەرچاوە، ل ٢٤.

٦ـ هەمان سەرچاوە، ل ٢٥.

٧ـ گردی شەهیدان، ل ١٢.

# رەخنەی ئەدەبی... (گردی شەهیدان)

**ساجد ئاوارە**

چیرۆکێکی کۆمەڵایەتییە لە نووسینی کاك: مجەرەم محەمەد ئەمین: ئەکەویتە (٢٤) لاپەڕە.

١- بەرگ: نیگاری بەرگ دەست کردی کاك (ئازاد شوقی) یە هەرچەندە بە تەواوی لە یاسای وێنە و نیگار نازانم بەڵام هەندێ شت سەرنج ڕائەکێشێ ئەویش (پۆلا کە ئەنیشکی داوە بەسەر کێلی قەبرەکە دەستی خستۆتە بنا گوێ، ئەمە لام وایە لە (واقعیی)یەوە دوورە، چونکە لە هەڵوێستی (مواقف)ی وادا کە سەرنج لە دیمەنێکی پڕ بەزەیی و بێ وردبوونەوە بدرێ دەست ئەخرێتە ژێر چەناگەیەوە، یان دەست بە نوقاوەیی دائەنرێ وە ڕوومەت ئەخرێتە سەری، بەڵام لەو وێنەیە دا کە زللەیەکی کێشاوە بە ڕوومەتی خۆیا.

٢- پیرەژن دانیشتووە، بەڵام هیچ شوێنەوارێکی دەموچاوی نیە: بە ڕاستی کاك ئازاد هونەرمەندی لێرەدا دەرخستووە چونکە وێنەیەکی ئافرەتی جگەرسوتاو کە لە ناو جەرگەی خەفەتبارییا ئەژی زۆر لە وێنەکەی —لوحە بیکاسۆ- (ناخۆشی مرۆڤی رەنجبەر) ئەچی کە دەموچاوی ئافرەتەکەی بە تەواوی دەرنەخستووە. وا بەرگ هەڵئەدەینەوە (پێشکێش)کراوە. داخەکەم لەم سەدەی بیستەمەدا کە دەنگی دوورترین ئادەمیزادی دڵپاك دێتە گوێمان، وەك گوێمان لە دەنگی برایەکی دڵسۆزی خۆمان بیت وایە، جا لەبەر ئەم هۆیە ئەبوایە (پێشکێشەکە لە چوارچێوەیەکی فراوانتر بوایە).

پێشەکی: نوسینی کاك (کامەران موکری)ە، کاك کامەران لام وایە لای سەمەرە نەبێ دوو جۆرە خوێندەوارمان هەیە، کۆلکە خوێندەوار و خوێندەواری تەواو. جا لەبەر ئەوەی هەر نووسراوەی دەربچێ هەردوو لا ئەخوێنینەوە ئەبێ نووسراوەکە مەبەستی روون و دیار بێ. لە لاپەڕە (٥) لە دێری (٢-٩) مەبەست گومە... ئەڵێن بۆ....

١- کاك کامەران باسی نەتەوەی (توێنراو) ئەخاتە بەردەم خوێندەواران جا ئەبوایە بۆ بەڵگە و نموونەیەك لەو نەتەوە (توێنراوەی) بخستایەتە پێش چاو کە لە مێژوودا رووی داوە. هەروەها ئەگەر توانرا نەریت و یاسایەکی نەتەوەیەك (بتوێنرێتەوە) هیچ هێزێك نییە (زمانی) ئەو گەلە لەناو بەرێ (بۆ بنەوانی ئەم قسەیەش کتێبی الماركسية في علم اللغة) سەیر بکەن.

٢- هەروەها ئەڵێ (لە چەرخی بزووتنەوەی نەتەوایەتی ... تاد) ئا لەو چەرخەی کە کاك (کامەران) باسی ئەکات نەتەوەی (توێنەر) و (توێنراو) ماوە و فەرمانی پێ ئەکرێ یان نا؟ ئەبوایە تۆزێکی لێ بدوایە چونکە پەیوەندی بە نەتەوەکەمانەوە هەیە.

٣- چەند (وشەیەك) کە زۆر نووسەر بەکاری ئەهێنێ و لە جێی خۆی نییە و نرخی (موضوعي) ووتار کەم ئەکاتەوە و وەك (برا و خوشکی خوێندەوارم) (هاوڕێینە .. تاد). ئەم جۆرە وشە ناراستەکەرانە (موضوع بە زاتەوە) ببەستیتەوە نووسینی نرخێکی ئەوتۆی نییە.

ئیتر سوپاسم بۆ کاك (کامەران) کە باسەکە هێندە بە نرخ و گرنگ بوو کە شایەنی لێ کۆڵینەوە بوو.

چیرۆکی (گردی شەهیدان) چیرۆکەکە وەك کاك کامەران وتویتی (دیاری کراو نییە) چونکە لە ئەنجامی خوێندنەوەی هەست ئەکرێت کە نووسەر لە زۆر جێگە پاڵی بە خۆیەوەوە ناوە -تكلف- بۆ نووسین هەرگیز (بیرەکە نەگەیشتووە) -نضوج الفكرة- جا لەبەر ئەم هۆیە لە وێنەیەکی -شکل- ترا دایڕشتایە و تەرزێکی روودراوی -اسلوب واقعي- بدایایەتی- بەڵام ئایدۆلۆژی و کات و شوێنی (الزمان و المكان) چیرۆکەکە بێ گەردە، هەروەها باسی (موضوع) چیرۆکەکە بیرێکی جوان و پووختە هەمیشە

پاڵپێوەنەرێکە بۆ هەموو کەسێکی هەستدار کە پاراستنی نیشتیمان بە ماڵ و بە گیان و خێزان سەربەرزی و کامەرانیە.

١- لەلاپەرە (٩) لە دێری (١٣) ژنەکە بەبێ چەند و چونی ئەڵێت: (ئەزانم هاتووی زاخاوی چاوت بدەیتەوە بەم دیمەنە جوانە). لام وایە کاک (محەرەم) شارەزایە لە زانستی دەروون (کە یەکێك هەمیشە دڵتەنگ و خامۆش بوو چۆن هەست بە جوانی ئەکات و هەموو کەس بە پێی دەروونی —نفسیەت- خۆی شت لە یەك ئەداتەوە، ئەگەر پیرەژنەکە بی وتایە (تۆش جەرگت سووتاوە بۆیە هاتووی بۆ سەر قەبران) ئەبوو بە وێنەیەك کە لەگەڵ هەست و بیری پیرەژنەکە ئەگونجا، وە یا چوون زانی هاتووە زاخاوی چاوی بداتەوە.

٢- لە لاپەرە (١٢) دێری (٥) ئەڵێت : (زللەیەکی کێشا بەڕانی خۆیا) لام وایە وشەیەکی جوان نەبێ لە ئەدەبیاتا چونکە ئەوترێ (زللەی دا بەبنا گوێیا) بەڵام بۆ (ڕان) ئەوترێ (دای بە ڕانی خۆیا) و یان (کێشای بە ڕانی خۆیا).

٣- لە لاپەرە (١٣) لە دێری (٣) ئەڵێت: ئەگەر ئێستا بمایە لە هەرەتی (٣٥) ساڵان دابوو، لە تەمەنی منالەکە و لە مێژووی نووسینی نامەکە و لەگەڵ ساڵی تیایا ئەژین بێ کەم و کوڕی تەمەنی پۆلا ئەکاتە (٣٥) ساڵ. ئەمە بۆ کاتی چیرۆکەکە بەرزە، بەڵام (پیرەژنێك نەخوێندەوار و نەزان چۆن ئەم ژمارانەی لێك داوەتەوە بێ کەم و کوڕی تەمەن لەو کاتەدا) دووربینی لە واقیعی بەدەرە.. جوانتر ئەوە بوو بڵێت: (ئەگەر بمایە لە سیرەی تۆدا ئەبوو) وە (لە تەمەنی تۆدا ئەبوو) لە واقیعی نزیك تر بوو.

٤- لە لاپەرە (١٦) دێری (٥) ئەڵێت : (قسەکانت نەختێ لە هی شار ناچێ.) کەچی شێوە (لهجة) قسەکانی لە نووسینا هەر لە شێوەی قسەکانی پیرەژنەکەیە).

٥- لە لاپەرە (٢٢) دێری (١٠) ئەڵێت: (باشە : بەیانی ئەنێرم بە شوێن خەرامانا، کاك بەکر وەڵامی دایەوە.) ئەمە تەرزی نووسینی بێگانەیە وەك

ئینگلیزی، رووسی، ئەمریکی، پاشتر (کاك بەکر لە وەڵاما وتی) ئینجا رستەکەی کاك بەکر بنووسی.

٦- بەڵام بە ڕاستی نامەکە جوان و کێشندەرە؛ بەڵام ئاخ دلاوەر هەردوو دەستی و لاقی گوللە نەیبردایە چونکە (رەحمەتی دەروونم لە ئازاری لەشی زۆر کەم کردۆتەوە). ئەمە ئەوپەڕی (ابداعة) ئەگەر گوللەکانی تۆزێ (بە بەزەیی بوونایە) وەك جێگای بریندار بکردایە.

٧- هەروەها نەمان زانی ئەم پیرەژنە بێ کەسە ئەم چەند ساڵە چۆن ژیاوە و چۆن ئەژی؟

ئیتر هیوادارم کاك (محەرەم) ئەم رەخنەیە بە دەروونێکی فراوانەوە وەرگرێ، چونکە هەر نووسینێك بە نرخ بوو، پێویستە لێ بکۆڵرێتەوە.

==================================================

* ئەم بابەتە لە لاپەڕە (٢) ی رۆژنامەی ژین ، ژمارە (١٤٣٠) ی رۆژی پێنج شەممە ١٩٥٩/٢/١٢ دا بلاوکراوەتەوە.

# ڕەخنەی ئەدەبی لە چیرۆکی (ڕێگای ئازادی)

**کامیل بەصیر**

تا ئێستا کۆمەڵە خوێندەوارەکان هیچ جۆرە ناکۆکی و دژایەتییەکیان پەسەند نەکردووە جگە لەو ناکۆکییەی لە نێوان ڕەخنەگر و ڕەخنە لێ گیراودا هەڵدەگیرسێ.

لەبەرئەوە من لەم نووسراوەمدا دەمەوێت (ڕەخنەی حیکمی) کە جۆرێکە لە دوو جۆرەکەی ڕەخنەگرتن، بکەم بە سەنگی کێشانی چیرۆکەکەی مامۆستا محەڕەم محەمەد ئەمین (ڕێگای ئازادی).. تاکو نرخی خۆی بدەمێ.. ئیتر ئۆباڵ بەئەستۆی ئەو مرۆڤانەی ڕەخنەگرتنیان لەلا پەسەندە، ئەگەر مامۆستا محەڕەم لە ڕەخنە پەسەندکەرەکان بێت ئەوا زۆر باشە، بەڵام خۆ ئەگەر لەو جۆرە مرۆڤانەش نەبێت ناچار بار نەکەم بۆ فاو.

* * *

ئەو کەسانەی چیرۆکی (ڕێگای ئازادی) ئەخوێننەوە، لەپێشا بە چیرۆکێکی درێژی مێژوویی دائەنێن کە چیرۆکنووسێکی کوردی نووسیبێتی، کە ئەم سێ سروشتە هەست پێکرا، دەستبەجێ ئەو یاسا و مەرجانە دێنەوە یاد ڕەخنەگر کە بیکەن بۆ نووسینی چیرۆکێکی وا.

بێگومان چیرۆکی مێژوویی مەرج و پێناسراو (ڤیزە)ی تایبەتی خۆی هەیە، هەروەها لەسەر ڕێ و شوێنێك درێژە ئەدرێ بە چیرۆك، چیرۆکی چیرۆکنووسێکی نەتەوەیەك سروشتی تایبەتی ئەو نەتەوەیەی پێوەیە.

لەبەر تیشکی ئەم وتانەدا، بزانین ئایا چیرۆکی (ڕێگای ئازادی) تا چ ڕادەیەك لەسەر بنکە و یاساکانی ئەم جۆرە چیرۆکانە لە ڕێبازیان لای ئەداوە، تاکو نرخی وێژەیی لەسەر دانێم.

چیرۆکی درێژ: بە پەرە رەشکردنەوە و جمەی کارەساتی یەك لەسەر یەك و ناوی زۆر نابێت، یا بە بەراوردی پچڕ پچڕ ناوەرۆکی چیرۆکەکە ئاخنرابێت، بەڵکو لەپێش هەموو شتێکا گرنگی ئەدرێت بە ئوسلووب و جۆری دەربڕینی رووداوەکان کە ئەبێ دەستێکی شارەزایی هونەروەر دایانرێژێ و دانە دەم یەکیان رێکوپێك بێت.

هەروەها جۆری پیشاندانی کەسایەتییەکان و هەڵسووڕانیان لە مەجالی تایبەتی خۆیانا بەجۆرێك بێت کە خوێنەر هەست بکا رووداو و کارەساتی راستەقینەیە و.. (مرۆڤ)ی راستی ئەژین.. ئەوەش بەوە ئەبێ کە:

١ـ رێکخستن و دانە دەم یەکی کارەسات و رووداوەکان بەشێوەیەك بێت ئەگەر لە ژیانی خۆمانا بەرچاومان کەوت سەرمان سووڕ نەمێنێ و جێگای گومان نەبێت.. و شتی وای تیا نەبێ دووربێ لە راستییەوە کە رێی تێنەچێت.

٢ـ وێنەی شەخسیاتەکان بەجۆرێك بهێنێتە بەرهەم کە بگونجێ لەگەڵ رەوشت و پێناسراوی تایبەتی ئەو مرۆڤانەی لێیان ئەدوێ، یان لە چیرۆکەکەدا دەوریان دەداتێ، هەموو جووڵانەوە و هەڵسووڕانێکی ئەو مرۆڤە لەگەڵ رەوشتی تایبەتی خۆیدا رێکەوێ.

چیرۆکی (رێگای ئازادی) ئەو مەرج و سروشتانەی لەسەرەوە لێی دواین سەرانسەر لێیان بێبەری بوو (تیا نەبوو).. تەنها ئەوە نەبێ بە درێژایی (٦٤) لاپەرەی رەش کردۆتەوە، ئاخنیوێتی لە کارەسات و رووداوی سەیر سەیری یەك لەسەر یەك.. بەڵام وەکو وتمان رێکخستن و دانە دەم یەکی رووداوەکان بە ئوسلووبێکی ئەدەبی و پیشاندانیان بە وێنەی چیرۆکێکی درێژ.. ئەتوانم بڵێم لە چیرۆکەکەدا هەر نەبووە.. کاك محەرەم ئەو کارەساتە زۆرانەی لە ماوەی چوار ساڵی رەبەقا.. (لە رۆژی بەستنی پەیمانی بەغای شەڕاویەوە ١٩٥٤ ـ ١٩٥٥ تا رۆژی ١٤ی گەلاوێژی پیرۆز ١٩٥٨) بەرچاوی کەوت کورتی کردۆتەوە بەجۆرێکی وا کە زۆر لە راستییەوە دووری خستونەتەوە.. ئەوەش هۆی ئەوەیە کە دێتەسەر ئەم کارەساتە زۆرانە، ئەمەندە بێ شومارن کە ناتوانرێ (بەلای مامۆستا محەرەم)ەوە بنووسرێ لە چیرۆکەکەدا، کەواتە یەکسەر دێتەسەر کورتکردنەوە یان بە ئەسلووبێکی تێکەڵاو.

خۆ ئەگەر لەسەر یەکێ لەم ڕووداوانە چەقی، ئەوا دوو سێ دێڕی لەبارەوە نووسینی و (ئەها.. ڕائەکا). ئەم کورتە باسەی بەلای منەوە دووری ئەخاتەوە لە واقیع، چونکە مامۆستا ئەیەوێ لایەکی کارەساتەکان بگرێ، بێ ئەوەی گوێ بداتە ئەو هۆیانەی ئەم کارەساتانەیان خولقاندووە.. (عەبدولکەریم) دێتەوە ژوورەوە، دایکی و باوکی دانیشتوون، ساتێ لەوەپێش لە باسی عەبدولکەریم ئەدوان، دایکی داوای ژنهێنانی لێئەکا، عەبدولکەریم دەستبەجێ وەلامی ئەداتەوە:

**(دایە! جارێ من ئامانجێکی زۆر گەورەم هەیە.. پەیمانم داوە تا ئەیگەمێ ژن ناهێنم).**

ئایا ئەم دەربڕینی نهێنییە لە عەبدولکەریم قاسم ڕائەبینرێت وا زوو بەزوو بۆ دایکێکی نەخوێندەوار!؟ بێگومان نەء. عەبدولکەریم یەکێ لە سروشتە پێناسراوەکانی ئەوەیە کە زۆر لەسەرخۆ و ئارامە.

مامۆستا محەرەم ویستی ئەم چەند وتەیەی نێوان عەبدولکەریم و دایکی خێرا بڕێنێتەوە و کۆتایی بێت، تا ڕاکاتە سەر باسێکی کە بێ ئەوەی بیر لە شەخسیەتی عەبدولکەریم بکاتەوە.. تەنانەت کەوتە ناو ئەم چەلەمەیەوە کە بەدەم عەبدولکەریمەوە ئەو چەند وتەیە هەلبەستێ.

چیرۆکی (ڕێگای ئازادی) چیرۆکێکی درێژ نییە.. بەلکو نووسراوێکە بەچەند سەر لەوحەیەك پڕکراوەتەوە و.. درێژە بەسەر لەوحەکان دراوە.. ئەمەیە سروشتی چیرۆکەکە.

ئەی با بزانین سروشتی دووەم کە چیرۆکێکی مێژووییە. ئایا ئەگونجێ ناوی بنێین چیرۆکی مێژوویی؟ نەء ؛ لەباوەڕی منا ئەو مەرجانەی ئەم چیرۆکە ئەکەن بە چیرۆکێکی مێژوویی دوورە لێوەی، چیرۆکی مێژوویی گەلێ جیاوازی هەیە لەگەل پەڕاوی مێژوو.. پەڕاوی مێژوو ڕووداو و کارەساتەکان ڕاستەوخۆ وەرئەگرێ و بێ پاش و پێش ئەینووسێ و ئەی ئاخنێ، بەلام چیرۆکی مێژوویی چەند ڕووداوێکی بەکەلك هەلئەبژێرێ.. دەست ئەکرێ بە داڕشتنیان..

بەشێوەیەك هەندێك لە رووداوەكان پاش و پێش ئەكرێ و لێی فرێ ئەدرێ، هەندێ جاریش گەلێ شتی پێوە ئەنرێ لەناو چوارچێوەی ماددەی مێژووەكە(١).. بۆ ئەوەی راستەوخۆ ئەو ئامانجەی چیرۆكنووس ئەیەوێ لە چیرۆكەكەدا دەری برێ بیدا بەدەستەوە.

بەڵام چیرۆكی (رێگای ئازادی) هەروەك رۆژنامە و گۆڤار و ئێستگەكان و كاروبار و رووداوەكان ئەگێڕنەوە، یەكسەر بێ دەستكاری نووسراوەتەوە، ئەمەش نابێ وابێ، چونكە وەكو وتمان ئەمە چیرۆكە نەك مێژوو.. چونكە بەم جۆرە چیرۆكەكە ئەبێتە كورتكراوەی ئەو شتانەی نوسەر تا ئێستا خوێندویەتییەوە و بەرگوێی كەوتووە.

سەرەڕای ئەمەش جارجار گۆڕینێكی دوور لە واقیعەوەی داوە بەتەنگ چیرۆكەكەدا.. وەكو چووە جوغرافیای بەغای شێواندووە.

كاتێك ڕەئیس بەكر لە تەحقیقاتەوە بەرەو خەستەخانە ئەبرا.. لە نزیك وەزارەتی بەرگرییەوە چاویان بە دووكەڵی كۆشكی رەحاب دەكەوێ، بەڵام هەر كەسێك بەغای دیبێ ئەزانێ كە كۆشكی ڕەحاب بەرێكی بەغا كەوتووە و تەحقیقات و وەزارەتی بەرگری بەرێكی كە كەوتووە.

مایەوە سەر ئەوەی بزانین ئەگەر خەڵكی ئەم چیرۆكە بخوێننەوە ئەزانن چیرۆكنووسێكی كورد نووسیویەتی؟!

وەكو وتمان چیرۆكی هەر نەتەوەیە سروشتی تایبەتی خۆی هەیە، كە بەهۆی ئەو سروشتانەوە ئەناسرێتەوە. كە بێگومان تام و لەزەتێكی تایبەتی هەیە، وەكو مەسەلا ئەڵێین چیرۆكی رووسی (واقیعیی ئیشتراكییە). هەروەها چیرۆكە رۆمانسییەكانی فەرەنسا و چیرۆكەكانی ئینگلیز كە واقیعی تەقلیدین، بەڵام ئایا چیرۆكی (رێگای ئازادی) هیچ جۆرە پێناسراوێكی چیرۆكی كوردی هەڵگرتووە؟ بێگومان نەء، هەزار جار نەء، ئەوە ئەبێ (رێگای ئازادی) بە زمانی كوردی

نووسراوەتەوە و هەندێ ناوی تیا بەکارهێنراوە کە میللەتی کورد بەکاری ئەهێنن، ئەمە هەموو کوردایەتی چیرۆکەکەیە.

کەواتە بەهیچ جۆرێك لە کاروبارێك نەدواوە کە ئامانجی کورد بهێنێتە دی.. وەکو رۆژی رزگاری و ئازادی کورد.. یان هیچ نەبێ تۆزێ لە باسی چەوساندنەوە و جیاکردنەوەی رەگەز و سەپاندنی نارەوا بەسەریانا نەدواوە.

جگە لەوەی کە کورد دوو جۆر ئەچەوسایەوە بەدەست کۆنەپەرست و چڵکاوخۆرەکان و.. بەدەست ئیمپریالیستی ئاغایانەوە.. کە عەرەبەکان لەم رووەوە بە وێنەی کورد نەبوون.

هەروەها داگیرکردنی مافی چینێك لەلایەن چینێکی ترەوە، کە بەراستی زامی دەمێ ساڵەی میللەتی کوردە، بەڵێ کە چیرۆکەکەت خوێندەوە بۆت دەرئەکەوێ کە بەرییە لەم مەرجانە.

کەواتە چیرۆکی رێگای ئازادی چیرۆکێکی مێژوویی درێژی کوردی نییە، بەڵکو (نووسراوێکی کوردییە بە چەند کارەساتێکی مێژوویی کورتکراوە ئاخنراوە).

==================================================

* ئەم بابەتە لە رۆژنامەی ژین ، ژمارە (١٤٨٣) و (١٨٣٤) ی ساڵی ١٩٥٨دا بڵاوکراوەتەوە.

# وەڵامی رەخنەکەی ریگای ئازادی  کە لەلایەن مامۆستا کامیل بەصیرەوە گیراوە

جیهان عومەر

لەپێش هەموو شتێکدا مامۆستا کامیل بە پێشەکییەکی رەخنەگرانە و رەخنەلێگیراودا هاتووەتە خوارەوە.. لەگەڵ کورتە باسێکی نووسینی چیرۆك.. بۆ دەربڕینی هەندێ لەو شارەزاییەی کە هەیەتی لە نووسینی چیرۆکدا، کە ئەیەوێت ئەو هەڵانە بەو جۆرە شتانە داپۆشێ، ئەگەر پێی زانراو، ئەگەر پێشی نەزانراو چاوی لێ پۆشرا ئەوا هیچ. بەڵام ئەمە ئەبێتە هۆی ئەوەی کە گوناهێکی گەورەت لە وێژەی کوردی کردووە، لەبەر ئەوە بە پێویستێکی سەرشانی خۆم زانی کە هەستم بە وەڵامدانەوەی مامۆستای ناوبراو.. کە هەرچەندە رەمبێکم منیش چەند هەڵەیەکم تیا کردبێت، وەیا ئەو شارەزاتر بێت، بەڵام هەر یەکێ ئەبێت کە نووکە پێنووسی بدا لەهەردووکمان، وە جیامان بکاتەوە.. وە لەگەڵ ئەوەشدا راستمان بکاتەوە.. ئەگەرچی پێویستە مامۆستای بەنرخ بەچاوێکی قوتابییەوە سەیرم بکات و.. بەسنگێکی فراوانەوە وەڵامی رەخنەکە وەربگرێت، هەتاوەکو بە هەڵەدا نەچێت.. یان ئەو گوناهە لە وێژەی کوردی نەکرێت.

لەپێش هەموو شتێکا مامۆستا هەستاوە بەگرتنی رەخنە لەوەی کە رووداوەکان بەدەستێکی شارەزایی تەواو دانەرێژراوە، بەڵکو ناتەواوە.. جا بە مامۆستا ئەڵێم کە بۆ جاری دووەم چاوێك بگێڕێتەوە بە "رێگای ئازادی"دا بەڵکو بزانێت ئەو رووداوانە بەشێوەیەکی وەها دارێژراوە کە پیاو ئەیخوێنێتەوە مووچڕکەی پیا دێت.. ئەیەوێت

زوو بگاتە کۆتایی چیرۆکەکە و.. لەوکاتەدا هەست ئەکەیت کە خۆت یەکێك بووی لەگەڵ ئەو قارەمانانەدا کە شۆڕشەکەیان کردووە.. هەمدیسان چاوخشاندنێك بەو کەسانەی کە لە چیرۆکەکەدان، هەروەکو سەرۆك عەبدولکەریم کە چەند هێمن و لەسەرخۆ بووە.. بەتایبەتی گەڕاندنەوە و خوێندنەوەی چیرۆکەکە، ئەگەر مامۆستا کامیل بیخوێنێتەوە بۆی دەرئەکەوێت کە سەرۆك لەکاتی چوونە یانەی ئەفسەرەکان و پاش ئەوەی کە چۆتە ماڵەکان بۆ کۆبوونەوە، جا ئەوسا مامۆستا بۆی دەرئەکەوێت کە ئەو کەسانە هەموویان لە قاڵبی خۆیاندا داڕێژراون و بێ کەمو کووڕی هیچیانی هەڵە نەکردووە کە مامۆستا محەرەم دایناون، وەیان بەپێی چیرۆکەکە ئەو کەسانە هەمووی پێویست بووە، ئەگەر یەکێکیان لێ کەل بکردایە لەوانەبوو چیرۆکەکە کەموکووڕییەکی تەواوی تیا ئەبوو.. چونکە هەر ئەو کەسانە بوون کە بوونەتە هۆی ئەوەی چیرۆکەکە ببەستن بەیەکەوە.. بێ ئەوەی پچڕ پچڕی بکەن، کە تۆ وتووتە پچڕ پچڕە.

هەروەها مامۆستا ئەڵێت کە چیرۆکەکە بەتەواوی نەدراوەتە دەم یەك.. لەبەر ئەوە داوا لە مامۆستای ناوبراو ئەکەم کە پیشانم بدات.. بۆ ئەوەی بزانم لە کوێدا بێت، لەوە زیاتر کە شۆڕشەکە کراوە.. جا نازانم شۆڕشکردن جێی سەرسوڕمانە، یان شتێکی سروشتییە؟ لە وڵاتێکی داگیرکراودا بۆ ئازادی و دیموکراسی، هەموو کاتێ ئامادەی شۆڕشە.. چ لەلایەن گەل یان سوپاوە.

دوای ئەوەی مامۆستای ناوبراو ئەڵێت کە ئەو کەسانەی لە چیرۆکەکەدا بوون نەگونجاون لەگەڵ خوو رەوشتیان، ئایا بۆچی ناوی یەکێك لەوانەی کە نەگونجاون ناڵێت؟ کە هەموویان شۆڕشگێڕ بوون و هەریەکەیان شارەزاییەکی تەواویان لە هەڵسوڕاندنی شۆڕشدا هەبووە.. بۆیە توانیویانە کە یەك بگرن..

(ئەی من و تۆ بۆ نەمانتوانی لەگەڵ ئەوانەدا یەکبگرین لەپێش شۆڕشدا.. دەستێکیان هەبێت لەو شۆڕشەدا.. لەوە زیاتر کە بەدەنگی ئازادییەوە خەبەرمان بووەوە لە خەو؟ چونکە ئێمە ئیشمان هەر نووسین و رەخنەیە).

هەمدیسان مامۆستا ئەکەوێتە گێژاوی هەڵەوە بەوەی کە ئەڵێت: نەئەبووایە کارەساتی زۆری تیابووایە.. جا من لە مامۆستا ئەپرسم: ئایا ئەگەر چیرۆك رووداو و کارەساتی تیا نەبێت، واتە (موفاجەئە)ی تیا نەبێت بە چ چیرۆکێ ئەژمێرێ؟ چ تام و لەزەتێکی تیا ئەبێت؟ یان هونەری ئەو چیرۆکە لەکوێدا ئەبێت؟ هیوادارم مامۆستا پێ بنێت لەم راستییە، نەیخاتە پشتگوێ، چونکە لە چیرۆکدا مەرجە کە (موفاجەئە)ی تێدابێت، بۆ ئەوەی خوێنەر هەوڵ بدات زوو بگاتە ئەو ئامانجەی کە لەو چیرۆکەدایە و تامی هونەری چیرۆك بزانێت چییە.

مامۆستا ئەڵێت نابێت کە باسێك بەجێی بهێڵێت و بچێتە ناو باسێکی کەوە، بەڵام پێویستە کە مامۆستا ئەوە بزانێت کە چیرۆکی تازە مەرجێکی تایبەتی لەگەڵە کە ئەتوانێت چیرۆك لەیەك دوو جێگەدا باس بکەیت، وەکو ئەوەی کە تۆ باسی جێگایەکی بۆ بکەیت، پاش ئەوە بوەستێت و بچێتە ناو باسێکی کەوە.. چونکە هەردووکیان پەیوەندیان بەیەکەوە هەیە.. ئەگەر لەیەك ئەدرێن ناتوانرێت ئەو باسە تەواو بکەیت.

یان مامۆستا ئەوەی بە هەڵە داناوە کە سەرۆك بەدایکی وتووە "ئامانجێکم هەیە، هەتاوەکو ئەو ئامانجەم نەیەتە کایە هیچ شتێك ناکەم" ئایا ئەمە هەڵەکەی لەکوێدایە؟ یان ئەمە نهێنی شۆرش بووە دەربخستووە کە تۆ بەنهێنیت داوە لە پێنووس؟ چونکە تەنها ئەو وتویەتی "ئامانج" و هیچی کە.. بەڵکو ئەو ئامانجە گۆرینێ بێت لەجێگایەکەوە بۆ جێگەیەك.. یان دروستکردنی خانوویەك بێت، ئەوسا ژنبهێنێ.. لەبەر ئەوە هەر خۆی زانیویەتی ئەو ئامانجە چییە؟ کەواتە ئەمەشیان هەڵە نییە، بەڵکو تۆ بەتەواوەتی تێنەگەیشتوویت.

مامۆستا ئەم چیرۆکەی بەنووسراوێك داوە لە پێنووس، کە نووسراو بریتییە لەوەی یان باسی سروشت یان باسی ئابووری و کۆمەڵایەتی و سیاسی و دڵداری و عاتیفی.. هتد، ئیتر هە چ شتێك بێت چونکە نووسراو (شەخصیاتی) تێ ناهاوێژرێت.. لەوە زیاتر لەو باسانە ئەدوێت و ئەڵێت ئەم نووسراوە بە سەر لەوحەیەك هاتەوە و نووسینەکەی بۆ نووسرابوو، تکا لە مامۆستا ئەکەم کە چاوێك بخشێنێت بەو چیرۆکە

گەورانەی چیرۆکنووسەکانی ولآتەکانی کەدا.. بزانە بەشی زۆریان بەشێوەی سەر لەوحە هاتووە یان نا؟ لەوانە (فی بیتنا رجل)، (لا انام) وە (الانسان) وە (لعنة الجسد).. کە ئەمانە یەك لەیەك بەرزترن، وە ئەگەر ماوەم ببوایە لەم نووسینەدا چەندەها ناوی چیرۆکی وەهام بۆ ئەنووسیت کە هەموویان لەم جۆرانەن.

ئینجا مامۆستا ئەڵێت: ئەم چیرۆکە مێژوویی نییە.. ئەی ئایا چ چیرۆکێك بە مێژوویی دائەنێت؟ چیرۆکێکی وەکو (رێگای ئازادی) کە پیشانی ئەدات کە وا شۆڕشێکی مێژوویی کە لە رۆژهەلآتی ناوەراستدا رووبدات بە رێکوپێکی و بێ ئەوەی مامۆستا محەرەم یەکێك بێت لەو قارەمانانە، بەڵکو چیرۆکنووسێکە و هیچی کە، کە توانیویەتی شتێك هەڵبکرێنێت لەو شۆڕشە بێ ئەوەی ئاگای لە نهێنییەکانی بێت، ئەمە بە چیرۆکێکی مێژوویی نادرێت لە پێنووس؟ هیوادارم کە مامۆستا کامیل ناوێکی بۆ دابنێت، بەلآم من لەگەڵ مامۆستام لەوەی کە ئەڵێت: جوغرافیای بەغای تێکداوە، ئەویش لەوەدا کە ئەڵێت: بەکر لە تحقیقاتەوە ئەچێت بۆ خەستەخانە و لە رێگا کۆشکی رحاب ئەبینێت.. ئەمەیان ئەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی کە مامۆستا محەرەم شارەزایی ناو بەغای نەبێت، ئەوەش هۆی ئەوەیە کە مامۆستا کامل ئەڵێت.. بەلآم ئەگەر مامۆستا محەرەم شتێکی لە ویژەی بێگانە هەڵکراندبێت.. ئەوا مانای ئەوەیە دەها باشتر، چونکە توانیویەتی لە ئەتەوەیەکی کە بدوێت بێ ئەوەی ئاگای لە ژیانی سروشتیان بێت.. بەلآم ئایا هیچ هەڵناکەوێت کە لە شارێکی وەکو بەغا چەند کوردێکی تیا بژی، ناوی کوردییان هەبێت و بەشداری ئەو شۆڕشە بووبن؟ بەڵێ ئەمە هەیە و چەند کەسێك لە رۆڵەکانی کورد بەشداری شۆڕشیش بوون.. لەبەر ئەوە هەڵە نییە کە لە چیرۆکێکی وەهادا باسی شۆڕشێك بکات و چەند ناوێکی کوردی تیا هەبێت.. لەبەر ئەوە کە کورد هاوبەشی شۆڕشەکە بووە، لەبەرئەوە هیوادارم کە مامۆستای ناوبراو هیچ زویر نەبێت لەم وەلآمی رەخنەیە.. بەڵکو بەدڵێکی فراوانەوە هەڵەکانی چار بکات.

==========

* ئەم بابەتە لە رۆژنامەی ژین ، ژمارە (١٤٨٧) و (١٤٨٨) ی ١٩٥٨ دا بلآوکراوەتەوە.

**بەرهەمەکانی**

**زنجیرەی شاکارنووسانی کورد لەسەدەی بیستەم دا :**

١- محەمەد مەولوود مەم

٢- محەڕەم محەمەد ئەمین

٣- جەمیل سائیب

٤- ئیبراهیم ئەحمەد

٥- دڵشاد مەریوانی

تێبینی : بڕیار بوو جێ ی (١٠) شاکارنووسی کورد لەم زنجیرەدا جێبکەمەوە، بەڵام چونکە ئەم کارە کات و ماندووبوونێکی یەگجار زۆری پێویستە، بۆیە بڕیارمدا جارێ تەنها کار لەسەر ئەو (٥) شاکارنووسە بکەم و تەنیا ئەوان لەسەر ئەم زنجیرە بکەم بە ماڵ. جا ئەگەر تەمەن و کات هەبوو ئەوانی تریش لە دوای ئەوان تەواو بکەم.

هەر بەم بۆنەیشەوە سوپاسی هەرکەس و لایەن و دەزگایەك دەکەم کە هەر لێکۆڵینەوەیێکی ڕەخنەیی یان نووسراوێکی دیکەی ناو ڕۆژنامە و گۆڤارەکان لەبارەی شاکارنووسانی داهاتوومان کە (جەمیل سائیب و ئیبراهیم ئەحمەد و دڵشاد مەریوانی)ن لەلا دەست دەکەوێت بۆم ڕەوانە بکات، من یەگجار سوپاسمەندیان دەبم و لە کتێبەکانی داهاتووشماندا لە سوپاسنامەدا ناویان دەبەم و چەند دانەیەکیش لە کتێبە چاپکراوەکان بە دیاری پێیان دەبەخشم. هاوکاری هەرکەس و لایەنێك دەبێتە مایەی سەرکەوتنی زیاتر و پوختترکردنی زنجیرەی شاکارنووسانی کورد لە سەدەی بیستەم دا.

**(د. ئازاد)**

نووسراوەتەوە و هەندێ ناوی تیا بەکارهێنراوە کە میللەتی کورد بەکاری ئەهێنن، ئەمە هەموو کوردایەتی چیرۆکەکەیە.

کەواتە بەهیچ جۆرێك لە کاروبارێك نەدواوە کە ئامانجی کورد بهێنێتە دی.. وەکو رۆژی رزگاری و ئازادی کورد.. یان هیچ نەبێ تۆزێ لە باسی چەوساندنەوە و جیاکردنەوەی رەگەز و سەپاندنی ناڕەوا بەسەریانا نەدواوە.

جگە لەوەی کە کورد دوو جۆر نەچەوسایەوە بەدەست کۆنەپەرست و چڵکاوخۆرەکان و.. بەدەست ئیمپریالیستی ئاغایانەوە.. کە عەرەبەکان لەم رووەوە بە وێنەی کورد نەبوون.

هەروەها داگیرکردنی مافی چینێك لەلایەن چینێکی ترەوە، کە بەراستی زامی دەمێ ساڵەی میللەتی کوردە، بەڵێ کە چیرۆکەکەت خوێندەوە بۆت دەرئەکەوێ کە بەرییە لەم مەرجانە.

کەواتە چیرۆکی رێگای ئازادی چیرۆکێکی مێژوویی درێژی کوردی نییە، بەڵکو (نووسراوێکی کوردییە بە چەند کارەساتێکی مێژوویی کورتکراوە ئاخنراوە).

=====================================================

* ئەم بابەتە لە رۆژنامەی ژین ، ژمارە (١٤٨٣) و (١٨٣٤) ی ساڵی ١٩٥٨دا بڵاوکراوەتەوە.

# وەڵامی رەخنەکەی رێگای ئازادی کە لەلایەن مامۆستا کامیل بەصیرەوە گیراوە

**جیهان عومەر**

لەپێش هەموو شتێکدا مامۆستا کامیل بە پێشەکییەکی رەخنەگرانە و رەخنەلێگیراودا هاتووەتە خوارەوە.. لەگەڵ کورتە باسێکی نووسینی چیرۆك.. بۆ دەربرینی هەندێ لەو شارەزاییەی کە هەیەتی لە نووسینی چیرۆکدا، کە ئەیەوێت ئەو هەڵانە بەو جۆرە شتانە داپۆشێ، ئەگەر پێی زانراو، ئەگەر پێشی نەزانراو چاوی لێ پۆشرا ئەوا هیچ. بەڵام ئەمە نەبێتە هۆی ئەوەی کە گوناهێکی گەورەت لە وێژەی کوردی کردووە، لەبەر ئەوە بە پێویستێکی سەرشانی خۆم زانی کە هەستم بە وەڵامدانەوەی مامۆستای ناوبراو.. کە هەرچەندە رەمبێکم منیش چەند هەڵەیەکم تیا کردبێت، وەیا ئەو شارەزاتر بێت، بەڵام هەر یەکێ ئەبێت کە نووکە پێنووسی بدا لەهەردووکمان، وە جیامان بکاتەوە.. وە لەگەڵ ئەوەشدا راستمان بکاتەوە.. ئەگەرچی پێویستە مامۆستای بەنرخ بەچاوێکی قوتابیەوە سەیرم بکات و.. بەسنگێکی فراوانەوە وەڵامی رەخنەکە وەربگرێت، هەتاوەکو بە هەڵەدا نەچێت.. یان ئەو گوناهە لە وێژەی کوردی نەکرێت.

لەپێش هەموو شتێکا مامۆستا هەستاوە بەگرتنی رەخنە لەوەی کە رووداوەکان بەدەستێکی شارەزایی تەواو دانەرێژراوە، بەڵکو ناتەواوە.. جا بە مامۆستا ئەڵێم کە بۆ جاری دووەم چاوێك بگێرێتەوە بە "رێگای ئازادی"دا بەڵکو بزانێت ئەو رووداوانە بەشێوەیەکی وەها دارێژراوە کە پیاو ئەیخوێنێتەوە مووچرکەی پیا دێت.. ئەیەوێت

زوو بگاتە کۆتایی چیرۆکەکە و.. لەوکاتەدا هەست ئەکەیت کە خۆت یەکێك بووی لەگەڵ ئەو قارەمانانەدا کە شۆڕشەکەیان کردووە.. هەمدیسان چاوخشاندنێك بەو کەسانەی کە لە چیرۆکەکەدان، هەروەکو سەرۆك عەبدولکەریم کە چەند هێمن و لەسەرخۆ بووە.. بەتایبەتی گەڕاندنەوە و خوێندنەوەی چیرۆکەکە، ئەگەر مامۆستا کامیل بیخوێنێتەوە بۆی دەرئەکەوێت کە سەرۆك لەکاتی چوونە یانەی ئەفسەرەکان و پاش ئەوەی کە چۆتە ماڵەکان بۆ کۆبوونەوە، جا ئەوسا مامۆستا بۆی دەرئەکەوێت کە ئەو کەسانە هەموویان لە قاڵبی خۆیاندا داڕێژراون و بێ کەمو کووڕی هیچیانی هەڵە نەکردووە کە مامۆستا محەرەم داینان، وەیان بەپێی چیرۆکەکە ئەو کەسانە هەمووی پێویست بووە، ئەگەر یەکێکیان لێ کەل بکردایە لەوانەبوو چیرۆکەکە کەموکووڕییەکی تەواوی تیا ئەبوو.. چونکە هەر ئەو کەسانە بوون کە بوونەتە هۆی ئەوەی چیرۆکەکە ببەستن بەیەکەوە.. بێ ئەوەی پچڕ پچڕی بکەن، کە تۆ وتووتە پچڕ پچڕە.

هەروەها مامۆستا ئەڵێت کە چیرۆکەکە بەتەواوی نەدراوەتە دەم یەك.. لەبەر ئەوە داوا لە مامۆستای ناوبراو ئەکەم کە پیشانم بدات.. بۆ ئەوەی بزانم لە کوێدا بێت، لەوە زیاتر کە شۆڕشەکە کراوە.. جا نازانم شۆڕشکردن جێی سەرسوڕمانە، یان شتێکی سروشتییە؟ لە وڵاتێکی داگیرکراودا بۆ ئازادی و دیموکراسی، هەموو کاتێ ئامادەی شۆڕشە.. چ لەلایەن گەل یان سوپاوە.

دوای ئەوەی مامۆستای ناوبراو ئەڵێت کە ئەو کەسانەی لە چیرۆکەکەدا بوون نەگونجاون لەگەڵ خوو رەوشتیان، ئایا بۆچی ناوی یەکێك لەوانەی کە نەگونجاون ناڵێت؟ کە هەموویان شۆڕشگێڕ بوون و هەریەکەیان شارەزاییەکی تەواویان لە هەڵسوڕاندنی شۆڕشدا هەبووە.. بۆیە توانیویانە کە یەك بگرن..

(ئەی من و تۆ بۆ نەمانتوانی لەگەڵ ئەوانەدا یەکبگرین لەپێش شۆڕشدا.. دەستێکیان هەبێت لەو شۆڕشەدا.. لەوە زیاتر کە بەدەنگی ئازادییەوە خەبەرمان بووەوە لە خەو؟ چونکە ئێمە ئیشمان هەر نووسین و رەخنەیە).

هەمدیسان مامۆستا ئەکەوێتە گێژاوی هەڵەوە بەوەی کە ئەڵێت: نەئەبووایە کارەساتی زۆری تیابووایە.. جا من لە مامۆستا ئەپرسم: ئایا ئەگەر چیرۆك رووداو و کارەساتی تیا نەبێت، واتە (موفاجەئە)ی تیا نەبێت بە چ چیرۆکێ ئەژمێرێ؟ چ تام و لەزەتێکی تیا ئەبێت؟ یان هونەری ئەو چیرۆکە لەکوێدا ئەبێت؟ هیوادارم مامۆستا پێ بنێت لەم راستییە، نەیخاتە پشتگوێ، چونکە لە چیرۆکدا مەرجە کە (موفاجەئە)ی تێدابێت، بۆ ئەوەی خوێنەر هەوڵ بدات زوو بگاتە ئەو ئامانجەی کە لەو چیرۆکەدایە و تامی هونەری چیرۆك بزانێت چییە.

مامۆستا ئەڵێت نابێت کە باسێك بەجێی بهێڵێت و بچێتە ناو باسێکی کەوە، بەلاّم پێویستە کە مامۆستا ئەوە بزانێت کە چیرۆکی تازە مەرجێکی تایبەتی لەگەڵە کە ئەتوانێت چیرۆك لەیەك دوو جێگەدا باس بکەیت، وەکو ئەوەی کە تۆ باسی جێگایەکی بۆ بکەیت، پاش ئەوە بوەستێت و بچێتە ناو باسێکی کەوە.. چونکە هەردووکیان پەیوەندیان بەیەکەوە هەیە.. ئەگەر لەیەك ئەدرێن ناتوانرێت ئەو باسە تەواو بکەیت.

یان مامۆستا ئەوەی بە هەڵە داناوە کە سەرۆك بەدایکی وتووە "ئامانجێکم هەیە، هەتاوەکو ئەو ئامانجەم نەیەتە کایە هیچ شتێك ناکەم" ئایا ئەمە هەڵەکەی لەکوێدایە؟ یان ئەمە نهێنی شۆرش بووە دەریخستووە کە تۆ بەنهێنیت داوە لە پێنووس؟ چونکە تەنها ئەو وتویەتی "ئامانج" و هیچی کە.. بەڵکو ئەو ئامانجە گۆرینێ بێت لەجێگایەکەوە بۆ جێگەیەك.. یان دروستکردنی خانوویەك بێت، ئەوسا ژنبهێنێ.. لەبەر ئەوە هەر خۆی زانیویەتی ئەو ئامانجە چییە؟ کەواتە ئەمەشیان هەڵە نییە، بەڵکو تۆ بەتەواوەتی تێنەگەیشتوویت.

مامۆستا ئەم چیرۆکەی بەنووسراوێك داوە لە پێنووس، کە نووسراو بریتییە لەوەی یان باسی سروشت یان باسی ئابووری و کۆمەلاّیەتی و سیاسی و دڵداری و عاتیفی.. هتد، ئیتر هە چ شتێك بێت چونکە نووسراو (شەخصیاتی) تێ ناهاوێژرێت.. لەوە زیاتر لەو باسانە ئەدوێت و ئەڵێت ئەم نووسراوە بە سەر لەوحەیەك هاتەوە و نووسینەکەی بۆ نووسرابوو، تکا لە مامۆستا ئەکەم کە چاوێك بخشێنێت بەو چیرۆکە

گەورانەی چیرۆكنووسەكانی ولاتەكانی كەدا.. بزانە بەشی زۆریان بەشێوەی سەر لەوحە هاتووە یان نا؟ لەوانە (فی بیتنا رجل)، (لا انام) وە (الانسان) وە (لعنة الجسد).. كە ئەمانە یەك لەیەك بەرزترن، وە ئەگەر ماوەم ببوایە لەم نووسینەدا چەندەها ناوی چیرۆكی وەهام بۆ ئەنووسیت كە هەموویان لەم جۆرانەن.

ئینجا مامۆستا ئەڵێت: ئەم چیرۆكە مێژوویی نییە.. ئەی ئایا چ چیرۆكێك بە مێژوویی دائەنێت؟ چیرۆكێكی وەكو (رێگای ئازادی) كە پیشانی ئەدات كە وا شۆرشێكی مێژوویی كە لە رۆژهەلاتی ناوەراستدا روویدات بە رێكوپێكی و بێ ئەوەی مامۆستا محەرەم یەكێك بێت لەو قارەمانانە، بەڵكو چیرۆكنووسێكە و هیچی كە، كە توانیویەتی شتێك هەڵبكرێنێت لەو شۆرشە بێ ئەوەی ئاگای لە نهێنییەكانی بێت، ئەمە بە چیرۆكێكی مێژوویی نادرێت لە پێنووس؟ هیوادارم كە مامۆستا كامیل ناوێكی بۆ دابنێت، بەلام من لەگەڵ مامۆستام لەوەی كە ئەڵێت: جوغرافیای بەغای تێكداوە، ئەویش لەوەدا كە ئەڵێت: بەكر لە تحقیقاتەوە ئەچێت بۆ خەستەخانە و لە رێگا كۆشكی رحاب ئەبینێت.. ئەمەیان ئەگەرێتەوە بۆ ئەوەی كە مامۆستا محەرەم شارەزایی ناو بەغای نەبێت، ئەوەش هۆی ئەوەیە كە مامۆستا كامل ئەڵێت.. بەلام ئەگەر مامۆستا محەرەم شتێكی لە وێژەی بێگانە هەڵكراندبێت.. ئەوا مانای ئەوەیە دەها باشتر، چونكە توانیویەتی لە ئەتەوەیەكی كە بدوێت بێ ئەوەی ئاگای لە ژیانی سروشتیان بێت.. بەلام ئایا هیچ هەڵناكەوێت كە لە شارێكی وەكو بەغا چەند كوردێكی تیا بژی، ناوی كوردییان هەبێت و بەشداری ئەو شۆرشە بووبن؟ بەڵێ ئەمە هەیە و چەند كەسێك لە رۆڵەكانی كورد بەشداری شۆرشیش بوون.. لەبەر ئەوە هەڵە نییە كە لە چیرۆكێكی وەهادا باسی شۆرشێك بكات و چەند ناوێكی كوردی تیا هەبێت.. لەبەر ئەوە كە كورد هاوبەشی شۆرشەكە بووە، لەبەرئەوە هیوادارم كە مامۆستای ناوبراو هیچ زویر نەبێت لەم وەلامی رەخنەیە.. بەڵكو بەدڵێكی فراوانەوە هەڵەكانی چار بكات.

==========================================

* ئەم بابەتە لە رۆژنامەی ژین ، ژمارە (١٤٨٧) و (١٤٨٨) ی ١٩٥٨ دا بلاوكراوەتەوە.

**بەرهەمەکانی**

**زنجیرەی شاکارنووسانی کورد لەسەدەی بیستەم دا :**

١- محەمەد مەولوود مەم

٢- محەرەم محەمەد ئەمین

٣- جەمیل سائیب

٤- ئیبراهیم ئەحمەد

٥- دڵشاد مەریوانی

تێبینی : بڕیار بوو جێ ی (١٠) شاکارنووسی کورد لەم زنجیرەدا جێبکەمەوە، بەڵام چونکە ئەم کارە کات و ماندووبوونێکی یەگجار زۆری پێویستە، بۆیە بڕیارمدا جارێ تەنها کار لەسەر ئەو (٥) شاکارنووسە بکەم و تەنیا ئەوان لەسەر ئەم زنجیرە بکەم بە ماڵ. جا ئەگەر تەمەن و کات هەبوو ئەوانی تریش لە دوای ئەوان تەواو بکەم.

هەر بەم بۆنەیشەوە سوپاسی هەرکەس و لایەن و دەزگایەك دەکەم کە هەر لێکۆڵینەوەیێکی ڕەخنەیی یان نووسراوێکی دیکەی ناو ڕۆژنامە و گۆڤارەکان لەبارەی شاکارنووسانی داهاتوومان کە (جەمیل سائیب و ئیبراهیم ئەحمەد و دڵشاد مەریوانی)ن لەلا دەست دەکەوێت بۆم ڕەوانە بکات، من یەگجار سوپاسمەندیان دەبم و لە کتێبەکانی داهاتووشماندا لە سوپاسنامەدا ناویان دەبەم و چەند دانەیەکیش لە کتێبە چاپکراوەکان بە دیاری پێیان دەبەخشم. هاوکاری هەرکەس و لایەنێك دەبێتە مایەی سەرکەوتنی زیاتر و پوختترکردنی زنجیرەی شاکارنووسانی کورد لە سەدەی بیستەم دا.

**(د. ئازاد)**



# Muharam Muhammed Ameen

Compiled by:
**Dr. Azad Hamad Sharif**

نووسەری شەهید (محەرەم محەمەد ئەمین) جگە لەوەی کە
چیرۆکنووسێکی ورد و بەتوانا و دەسترەنگین بوو،
رۆژنامەنووسێکی پلە یەک و وەرگێڕێکی بانسقەش بوو. ئەو
نووسەرە ئازا و بوێرە نەشتەرئاسا دیاردە خراپ و
بزێوەکانی کۆمەڵگای سەردەمی خۆی بە تەکنیکی نوێباو و بە
زمانێکی کوردی بەپێز و پتەوەوە دەخاتە بەر سەرنج و رەخنە.
چیرۆکەکانی (مام هۆمەر)، (شای قەرەجان)، (مربووی
زیندوو)، (پەتیارە) و (سەیرانێک لە ئەزمڕ) پڕاوپڕن لە خەم و
مەینەتییەکانی مرۆڤی چەوساوەی ئەو رۆژگارە و هەر
رستەیەک لەو چیرۆکانە هاوارێکی نارەزاییە بە رووی ستەم و
زۆرداریی ئەو سەردەمە. ململانێی چینایەتی و کێشەی
نەتەوەیی دوو تەوەرەی زۆر بایەخدارن لە سەرجەم
چیرۆک و نووسینەکانی ئەم نووسەرە ویژدان زیندووەدا.

**2 Kurdish Masterpiece Writers Series**

چاپخانەی رۆژهەلات/ هەولێر

2011